# كەليلەو دیمنە

دانەر
"بەیدەبا" فەیلەسووفی هندی

وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە
عومەر تۆفیق

سلێمانی ..................چاپی نوێ

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە(١٠٢)

## ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب: کەلیلەو دیمنە
- بابەت: چیرۆك و ئامۆژگاری
- نوسینی: بەیدەبا "فەیلەسووفی هیندی"
- وەرگێڕانی: عومەر تۆفیق
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- نۆبەتی چاپ: چاپی نوێ
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی: (٢٦٩١)ی ساڵی ٢٠١٠ی پێدراوە.

**ناونیشان:**

سلێمانی ـ بازاڕی سلێمانی ـ نهۆمی دووەم ـ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژ، مۆبایل، ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣

ژ، مۆبایل، سانا: ٠٧٣٠١١٩١٨٤٧

## پێشەکی وەرگێڕ [1]

ژیانی مرۆڤ پێویستی بەحەسانەوەو پشوودان هەیە، هەروەك هەموو شتێکی تری سرووشت کە لەگۆڕان و لادانداییە وە لەم دەمەدا کە سەدەی بیستەمە خوێندەواران لەزۆر شوێنی جیهاندا کاتی بێ ئیشی بەخوێندنەوە ئەبەنەسەر. وە بەوە هەندێك لەدەست باری قورسی ژیان ئەحەسێنەوە.

ئەمەش کتێبی (کەلیلەودیمنە)یە فەیلەسوفی گەورەی هیندی (بەیدەبا) دایناوە پڕی کردووە لەچیرۆکی بەنرخ و قسەی خۆش رنەستەق وەڕامیاری تەواو و زانین و ئامۆژگاری بۆ هەموو کاروبارێکی مرۆڤ وەلەسەر زمانی باڵندەو گیانەوەر ئەو شتانەی ووتوە لەبەر پاراستنی لەزۆرداران وتێنەگەیشتوان. ئەوەش لەسەرفەرمانی پادشای هیند (دەبشەلیم) کەئەم کتێبە شوێنی شانازی ئەوبوو بەجۆرێك کەگەورەیی و سوودی گەیشتە گوێی کیسرا (نەوشیروان)ی پادشای ئێران. ئەویش پزیشك و زانای گەورەی خۆی کەبرزەوی ناوبوو ناردی بۆهیند بۆهێنانی ئەو پەڕاوە. ئەویش بەچەند سزاو ناخۆشی هەتا لەوێ بەنهێنی دەری هێناو وەریگێڕایە سەرزمانی فارسی. وەلەسەدەی

[1] وەرگێڕ (عومەر تۆفیق) لەساڵی ١٩٤١ ز. لەدێی کێڵدەرەی نزیک ناوچەی بەرزنجە لەدایک بووە، وەلەساڵی ١٩٦٢ دالەشاری سلێمانی بووە بەمامۆستای سەرەتایی.

عەباسی بوێژی بەناو بانگ (عبدالله ئیبن و موقەففەع) کردی بەعەرەبی کەتا ئێستا جێگای سەرسوڕمانی ڕەخنەگرانی عەرەبە. لەپاشا بوێژە بێگانەکانی گەلێ وولات ئەم کتێبەیان وەرگێڕایە سەرزمانی نەتەوایەتی خۆیان لەبەر زۆری سوودو کەڵکی.

منیش لە عەرەبییەوە کردم بەکوردی بەهیوای ئەوە کە لە کاتی بێ ئیشی یان پێویستیدا بخوێنرێتەوەو سودی هەبێ بۆ هەموولایەك بەجۆرێك کە لە گەڵ ژیانی تازەی ئێستادا بگونجێ.

ئەمەش چاپی دووەمی کتێبەکەیە کە هەندێ بژارەمان کردو چەند هەڵەیەکی چاپیی کەلەچاپی یەکەمیدا ڕویان دابوو ڕاستمان کردەوە.

**عومەر تۆفیق**

١٩٧٥

# دەرگای پێشەکی پەڕاوەکە

پێشکەشی کرد بە"هنودی کوڕی سەحوان" کە ئەناسرێ بەعەلی کوڕی شاهی ئێرانی کە هۆی دانانی ئەم کتێبە باس ئەکا لە لایەن فەیلەسوف هیندییەوە کە سەرۆکی بەراهیمەکانی[1] هیند بووە. وەناوی لێ ناوە (کەلیلەو دیمنە)، کە (بەیدەبا) لەسەر زمانی چوارپێی و باڵندە داینا، لە بەرپاراستنی لەزۆردارو تێ نەگیشتووان. وە لەبەر جوانکردن و ڕازاندنەوەی بە وتەی جوان‌وپەندی بەرز کە سودی هەبێ بۆزانایان و ئەوانەی کە ئەیخوێننەوەو ئارەزووی ئەکەن .

وە "عەلی شا" باسی ئەوە ئەکات کە چۆن شای ئێران "کیسرا ئەنوشیروان کوڕی قوبازی فەیرووز" فەرمانی دەرکرد بۆ((برزەوەی))ناو کەسەرەك پزیشکانی ئێران بوو بۆدەرهینانی ئەم کتێبە لە وڵاتی هیند، وەچۆن برزەوی کە چووە هیند بوو بە هاوڕیی ئەوپیاوەی کە ئەم کنێبەی لە گەنجینەی شاهی بۆدەرهێنا بەشەو لەگەڵ هەندێ کتێبی زانایانی هینددا. وە لە بابەت خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە ئەڵێ کە مرۆڤ[2] ئەبێ باش سەرنج لە هەموو جۆرە ووتەیەکی بدا وە باش بیخوێنێتەوەو بەووردی تێی بگات. ئەگەر ئەوەی نەکرد بەئامانجی خۆی، لە مانای ئەم کتێبەناگات .

---

[1] بەراهیمە: نەتەوەیەکن باوەڕ بەناردنی پێغەمبەران ناکەن لەلایەن خواوە.

[2] مرۆڤ= ئینسان.

هەروەها باسی هاتنەوەی برزەوەی ئەکا، وەخوێندنەوەی کتێبەکەش بەئاشکرا. وە باسی هۆی دانانی بەشیک ئەکا لەم کتێبەدا کە پێی ئەووترێ (دەرگای برزەوەی پزیشك) کە لەلایەن (بوزور جەمهیرەوە) نوسراوە کە سەرەك وەزیرانی ئێران بووە، کە باسی چۆنێتی برزەوەی ئەکا لە کاتی لە دایك بونییەوە هەتا ئەو کاتەی کە فێری زانین وهونەرو کاری ڕەوشت باشی بوو، وە سوودی لێ وەرگرتن.

وە ئەم بەشەی خستەپێش بەشی (شێرو گا) کە دەستپێکردنی کتێبەکەیە، عەلی شای ئێرانی ووتی:

هۆی دانانی کتێبی (کەلیلەو دیمنە) کە فەیلەسوفی هیندی (بەیدەبا) داینا ئەوەیە کە((ئەسکەندەری زولقەرنەینی ڕۆمی)) کە دەستی کۆتاکرد لە کاری پادشاکانی ڕۆژئاوا ڕوویکردە وولاتەکانی ڕۆژ هەلات بۆ داگیرکردنیان. وە بەشەڕکردن مایەوە لەگەڵ ئەوانەی کە ڕێگای داگیرکردنیان نەئەدا وەپەیمانی ئاشتی ئەبەست لەگەڵ ئەوانەی کە لەگەلیدا ڕێکئەکەوتن لەمانە بەزۆری پادشاکانی ئێران بوون کە ئەسکەندەر زالبوو بەسەریانداو پرش و بلاوی کردن. لەپاشا بەرەو وولاتی چین ڕۆیشت. وە بەخاکی هیندستاندا تێپەڕی و داوای لە پاشای هیند کرد کە سەری بۆشۆڕ بکات. لەو کاتەدا هیند پاشایەك سەرۆکایەتی ئەکرد کەزۆر بەهێز بوو پێیان ئەووت: (فوور) ئەم پادشایە کەزانی ئەسکەندەر بەتەواوی هێزی خۆیەوە هاتووە بۆهیند ئەویش خۆی بۆشەڕ ئامادەکرد .

وە خێرا لەشکرێکی گەورەی پێکەوەنا. وەلەناو لەشکرەکەدا گەلێك فیلی شەڕکەرو شێریش هەبوو. کە ئەسکەندەر بەم لەشکرە بەهێزەی

(فوور)ی زانی کە لە بەر زۆری ئەسپ لە شەوی تاریک ئەچوو، وە لە هیچ پاشایەك وێنەی ئەوەی نەدی بوو، لەبەر ئەوەبوو کە لە شکاندنی لەشکرەکەی ترسا کە ئەگەر پەلە بکا بۆشەڕ لەگەڵ فووردا.

وەکو ئەگێڕنەوە کە ئەسدکەندەر پیاوێکی فێڵاوی و زۆرزان بووە.

فەرمانیدا بەهەڵکەندنی چاڵێك لەپێشی لەشکرەکەیدا، وەکۆبونەوەیەکی کردو بانگی ئەستێرەناسانی کرد. وە فەرمانی پێکردن کە ڕۆژێك دابنێن کە کامەرانی لەشکری تیادابێت ئەوانیش ئەوکارەیان پێکهێنا.

هەروەها ئەسکەندەر بەهەروڵاتێکدا تێئەپەڕی وەستاو پیشەسازە ناودارەکانی هەموو پیشەسازیەکی گرنگی لەگەڵ خۆیدا ئەبرد.

بەم جۆرە ئەسکەندەر بەزیرەکی خۆی داوای لە وەستاکان کرد کە ئەسپێکی لەمس بۆدروست بکەن کەناوەکەی بۆش بێت. وە لە سەر ئەم ئەسپە پەیکەری پیاو دروست بکرێ و لەسەر ڕەوڕەوە بڕوا، کەپاڵی پێوەبنێن بەخێرایی بچێتە پێشەوە. وەفەرمانیدا کەناوەکەی پڕبکرێت لەنەوت وگۆگرد، وەبخرێتە پێش ناوجەرگەی لەشکرەکەو لە ناوەوە ئاگری تێ بەر بدرێ لەکاتی شەڕدا. ئەم کارە تەواو بوو، وە ئەو ڕۆژەش کە ئەستێرەناسەکان دایاننابوو نزیك بووەوە.

لەو کاتەدا کە پیاوەکانی ئەسکەندەر کە ناردبوونی بۆلای (فوور) کە بەبێ شەڕکردن سەری بۆشۆڕبکا هاتنەوەو وەڵامی توندو تیژی پادشای هیندیان بۆهێنا. لەم وەڵامەدا دیاربوو کە خۆی ئامادەکردبوو بۆشەڕێکی گەورە.

کە ئەسکەندەر زانی کەوا ( فوور) ئامادەی شەڕە ئەمیش لە شکری خستەڕێ. پادشای هیند فیلەکانی خستبوە پێش لەشکرەکەیەوە.

سەربازەکانی ئەسکەندەر ئەسپە مسەکەیان پاڵ پێوەنا لەگەڵ پەیکەرە سوارەکاندا. فیلەکان پەلاماری ئەسپەکەیانداو لەمۆزیان تێوە ئالاند.

لەبەر گەرمی ڕاپەڕین و هەرچی سوار هەبوو بەسەریانەوە خستیانە خوارو بەپێ شێلایان و ڕایان کرد. وە هەرچی هاتە ڕێیان بەسەریا ڕۆیشتن. بەم جۆرە لەشکرەکەی (فوور) پرش و بڵاو بۆوە، ئەسکەندەرولەشکرەکەی شوێنیان کەوتن و زۆریان لێ بریندار کردن. لەوکاتەدا ئەسکەندەر هاواری کرد: ئەی پادشای هیند خۆتمان بۆدەربخە باماڵ و لەشکرت لەدەست نەچێ. ئەوە پیاوەتی نییە کە پادشا سەربازی خۆی بەخۆڕایی لەناو ببات. خۆتم بۆدەربخە وازبێنە لە سەرباز هەرکامێکمان زاڵبووین بەسەر ئەوی ترمانا بالەشکرەکەی سەرکەوتووبێ، کە(فوور) ئەوەی بیست بەهەلی زانی بۆلەناو بردنی ئەسکەندەر، لەپاشا هەردووکیان لە سەرپشتی ئەسپەکانیان چەند سەعاتێك شەڕیان کرد، بەڵام کەسیان زیانیان بەیەکتر نەگیاند. کە ئەسکەندەر ئەم کارەی ماندوویکرد ئیترچارەی نەما. بەدزی یەوە دەنگە دەنگێکی خستەناو لەشکرەکەیەوە کە دەشت و دۆڵ دەنگی دایەوە. (فوور) ئاوڕی دایەوە، چونکە ئەوەی بە فێڵێك زانی کە لە ناو لەشکرەکەیدا ڕووی دابێ. ئەسکەندەر خێرا دای بە تەپڵی سەریداو لەسەر زین خستییە خوارەوە. کە هیندیەکان دییان چیان بەسەر هات بەجارێك پەلاماری ئەسکەندەریانداو شەڕێکی وایان لەگەڵکرد کەمردنی بەلاوە خۆشتر بوو.

ئەسکەندەر بڕیاریدا کە بەچاکی لە گەڵیاندا بجوڵێتەوە. بەم جۆرە بەسەریاندا سەرکەوت و وڵاتەکەیانی داگیرکرد، وەپیاوێکی لەباوەڕ

پێکراوانی خۆی کرد بەپادشا بەسەریانەوە. وەخۆی لە هیند مایەوە هەتا هەرچی پێویستی هەبوو هەمووی جێبەجێ کرد، لە پاشا بەجێی هێشت و بەرەو(چین) کەوتەڕێ. کە ئەسکەندەر خۆی و لەشکرەکەی لە هیند دورکەوتنەوە هیندیەکان بەرامبەر بەوپیاوەی ئەسکەندەر هەڵگەڕانەوە، وەپەیمانیان شکاندو وتیان: ئەمە لەگەڵ ڕامیاری* ئێمەدا ناگونجێ کە کەسێك سەرۆکایەتیمان بکات لەخۆمان نەبێت. لەپاشان کۆبونەوەو پیاوێکیان لە شازادەکانی خۆیان کرد بەپاشا کە پێیان ئەووت (دەبشەلیم).

وەئەوپادشایەی کە ئەسکەندەر بۆی دانابوون دەریان کرد.

کاتێ کە (دەبشەلیم) کاری پادشایی کەوتە دەست وە لەسەر تەخت جێ گیر بوو لە خۆی بایی بوو، وە پەلاماری پادشاکانی دەورو پشتیدا، وە هەمیشە سەرکەوتو بوو، بەجۆرێك کەدەست و پێوەندی هەموو لێ کەوتبووە ترسەوە، ئەویش کەخۆی وابەو جۆرە بەگەورەو زەبربەدەست چاو پێکەوت ئیتر گوێی نەئەدا بە کارو باری وولات، وە بەچاوێکی سوك سەیری گەلی ئەکرد. وە ڕۆژ بەڕۆژ خراپتر ئەبوو، هەر بەم جۆرە ماوەیەك مایەوە. لەودەمەدا، پیاوێکی فەیلەسوف هەبوو لە بەراهیمەکان کە لە زۆر کاروباردا پرسی پێ ئەکرا، وە لە سەر قسەی ئەو کارئەکرا و پێیان ئەوت ((بەیدەبا)). کە بەیدەبا پادشای هیندی بەو جۆرە دی بیری کردەوە بۆدۆزینەوەی چارەیەك کە بیخاتە سەر ڕێی ڕاست، لەبەر ئەوە قوتابیەکانی کۆکردەوە و ووتی: —

---

* ڕامیاری ـ سیاسەت

بزانن کە من زۆر لە کاری (دەبشەلیم)بیرم کردۆتەوە لە چونە دەرەوە لە دادپەرستی و ڕەوشتی باش، وەرگرتنی ڕێگەی چەوت بەرامبەر بەگەل، ئێمە ئەگەر ئەم کارانە بخەینە پشت گوێ توشی خراپە ئەبین و لەتێ نەگەیشتوان کەمتر سەیرمان ئەکرێ. وە ئێمە ناتوانین نیشتماتن و نەتەوەی خۆمان بەجێ بهێڵین. وەناشتوانین کەدژی بوەستین بەزمانمان نەبێ خۆتان ئەزانن دراوسێیەتی شێرو سەگ و مار و گا بەرامبەر بەپاکی نیشتمان و ژیانی خۆش زۆرلەخۆ کردنە. پیاوی زانا ئەبێ پارێزگاری لەخۆی بکا. وەك بیستومە کە فەیلەسوفێك نامەیەك بۆ قوتابیەکەی ئەنوسێ و ئەڵێ:- هاوڕێیەتی پیاو خراپ وەك سوار بونی دەریا وایە ئەگەرپیاو لە خنکاندن ڕزگاری بوو لە ترس ڕزگاری نابێ.

ئەگەر پیاو بەدەستی خۆی بکەوێتە تەنگ و چەڵەمەوە لە ڕیزی ئەو کارانە دائەنرێ کەمێشك و دەرونیان نییە، چونکە ژیانی چوار پێیی هەر لە بناغەوە دانراوە لە سەر زانین لە پەیداکردنی سوودی ژیان و خۆدور خستنەوە لە مردن. هەر لەبەر ئەوەیە کە نایان بینین خۆیان بخەنە تەنگ و چەڵەمەیەکەوە کە بەتەواوی لە ناو بچن. وە هەر لەبەر ئەم کارەبوو کە ئێوەم بانگکرد، چونکە پشتم بەئێوە بەستووە. ئێوە کەسی منن وەشوێن و نهێنی ئاشکرای منن. چونکە پیاوی تەنها کە گوێ لە کەس ڕانەگرێ لەناو ئەچێ وەکەس یارمەتیدەری نییە، بەڵام پیاوی ژیرو دانا بە ژیری کاروباری بەڕێوە ئەبا کەبەو جۆرە بەوڵاخ و سەرباز بەڕێوە نابرێ. بۆئەمەش پەندو سەرگوزشتەیەك هەیە: - ئەگێڕنەوە (کڵاوکوڕەیەك ) هێلانەیەك لەسەرە ڕێگەی فیلێکدا دروست دەکات و هێلکەی تێ ئەکات، هەموو جارێ فیلەکە بۆئاو خواردنەوە

تێئەپەڕێ. ڕۆژێك بەسەر هێلانەکەدا ڕۆیشت، هێلکەکانی پلیشاندەوەو بەچکەکانی کوشت، کلاو کورەکە هاتەوە و چاوی بەمە کەوت زانی ئەمە کاری فیلەکەیە، فری هەتا نیشتەوە بەسەر سەرییەوە بەگریان پێی ووت: ئەی پادشای گەورە بۆچی هێلکەکانت پلیشاندمەوەو بەچکەکانت کوشتم خۆمن دراوسێی ئێوە بووم. ئایا لەبەر بچووکی و کەم هێزی من بوو ئەوەتان کرد؟ فیلەکە ووتی: بەڵێ لەبەر ئەوە وامکرد. کلاوکوڕەکە ڕۆیشت بۆلای کۆمەڵێ باڵندەو سکالای خۆی بۆکردن. ئەوانیش ووتیان: ئێمە باڵندەی هەژارین بەرامبەر بە زەلامێکی گەورەی وەك فیل چیمان پێ ئەکرێ؟ لە پاشا چوو بۆلای قەلە ڕەشکەو پێی ووت: با بچین بەدەنووك هەردووچاوی هەڵکۆڵین، لە پاشا خۆم فێڵی تری لێ ئەکەم. لەسەر ئەم کارە پێك هاتن، چوون هەردوو چاویان کوێرکرد ئیتر فیلەکە ڕێی ئاو خواردنەوەی بۆنەئەدۆزرایەوە. لە پاشا کلاوکوڕەکە چوو بۆ لای بۆقەکان و سکالای خۆی کرد کەئەو فیلە چ زۆرێکی لێ کردووە. ووتیان: ئێمە بۆقی بێ دەستەلاتین بەرامبەر بەفیلێکی گەورە چیمان لەدەست دێ؟ ووتی: حەزئەکەم بچنە چاڵێکی نزیك و دەست بکەن بەقیڕەقیڕ ئەویش بەئاوی تێ دەگات و خۆی تێ فڕێ ئەدات. بۆقەکان گفتیان دایەو چوون دەستیان بە قیڕە قیڕ کرد فیلەکە کەتینوێتی کاری تێ کردبوو بەرەو دەنگەکە ڕۆیشت و بەئاوی تێ گەیشت. خۆی فڕێدایە ناو چاڵەکەوە ئیتر نەیتوانی خۆی دەربازبکات. کلاو کورەکە هاتە سەری و پێی ووت: هەی زۆردار کە بەهێزی خۆت بایی بوویت، بە چاوی سوك سەیری منت ئەکرد بڕوانە کەچیم پێ کردی لەگەڵ بچوکیمدا بەرامبەر بەزەلامێکی وەك تۆ.

که بەیدەبا لە قسەکەی بووە وە ووتی: ئەمەویٚ کە هەریەکە لە ئێوە ڕای خۆی دەر بڕیٚ لە بابەت چونی منەوە بۆلای ئەم پادشا زۆردارە. بەجارێك ووتیان: ئەی زانای گەورە فەیلەسوفی بەڕێز، تۆپێش ڕەوی ئێمەی، ئەبیٚ بیری ئێمە چیبیٚ بەرامبەر بە بیری تۆ، وە زانینی ئێمە چیبیٚ بەرامبەر بەزانینی تۆ. بەلاٚم هێندە ئەزانین کە مەلە کردن لەگەڵ تیمساح دا لەناوچونە، وەگوناهی ئەوکەسە بەملی خۆیەتی وەئەوکەسە کە زەهر لە دەمی ماردەردەهێنیٚ و ئەیخواو بەوە خۆی تاقی ئەکاتەوە گوناهی مارەکە چییە؟ وەئەوەی کە ئەچێتە سەر شێر لەلانەدا لەوە دڵنیا نییە کەپەلاماری نەدا. ئێستاش خۆت ئەزانی کەئەم پادشایە لەهیچ ناترسیٚ. ئێمەش ئەترسین توشی سزاو ئازارببی و ئێمەش بکەوینە تەنگو چەڵمەوە. بەیدەبای فەیلەسوف ووتی: قسەکانتان زۆرجوانبوو ئەوەش بزانن کە پیاوی ژیرو نەترس پرس بەگەورەو بچووك ئەکات وە لەم جۆرە کارانەدا شەرم ناکات، چونکە تەنیا قسەی یەك کەس کەڵکی لیٚ وەرناگیریٚ، بەلاٚم من چارەو ڕێگەم دۆزیوەتەوە. وەبڕیارمداوە و خۆم ئامادەکردووە کە بچمە لای کە هاتمە دەرەوە بەکۆمەڵ وەرن بۆلام.

بەیدەبا ئەمەی ووت و بەجێیهێشتن. ئەوانیش لە خودا پاڕانەوە کە لەو پادشا زۆردارە ڕزگاری بکات.

بەیدەبا ڕۆژێکی هەڵبژارد کە بچێتە لای پادشا، وەجلە پەلاٚسەکەی لەبەرکرد کە لە مووی ڕەش تەنرابوو جلی بەراهیمە بوو ڕۆیشتوە لە دەرگای پادشا ڕاوەستا. وە پاسەوانەکەی تیٚ گەیاند کە کەسیٚ هاتووە و ئامۆژگاریەکی بۆپادشا هێناوە. پاسەوانەکان پادشایان تیٚ

گەیاند ئەویش فەرمانی کرد کە بێتەژورەوە. بەیدەبا ڕۆیشتە ژورەوە ڕاوەستاو سەری خستە سەر زەوی و لەپاشا ڕەق وەستاو هیچ قسەیکی نەکرد. ( دەبشەلیم ) لەم بێدەنگ بوونەی ( بەیدەبا ) بیری کردەوە لە دڵی خۆیدا ووتی: ئەم پیاوە لەبەر دوشت زیاتر نەهاتووە: لەبەر هەژاری یان کارەساتێکی بەسەردا هاتووە کە لە توانایدا نییە، وە ووتی: ئەگەر پادشایان لە وولاتی خۆیاندا گەورەبن زانایان گەورەترن، چونکە ئەوان بەزانین لە پادشا دەوڵەمەندترن. بەڵام پادشا هەرگیز بەماڵ بەرامبەرکێی زانینی پێ ناکرێ، زانین وشەرم کردن دوو هاوڕێی خۆشەویسی یەکن کە جیانابنەوە. ئەگەر یەکێکیان نەما ئەوی تریش نامێنێ وەك دوو هاوڕێی خۆشەوست کە یەکێکیان لەناوچوو ئەوی تریش ژیانی لێ تاڵ ئەبێ. ئەوەی شەرم لە زانا نەکاو ڕێزی نەگرێ مێشکی نییەو بە نەزان دەرئەکەوێ.

لەپاشا سەری بەرزکردەوەو پێی ووت: ئەی بەیدەبا ئەتبینم کە قسەناکەی وە باسی پێویستی خۆت ناکەی، منیش ووتم: کە ترسێك یان سەرسوڕمانێك گرتبێتی. لەبەر ئەوەی کە دەمێکە وەستاوم ووتم ڕەنگە لەبەر کارێك نەبێ نەهاتبێتەئێرە. ئەوە چاکترین پیاوی ئەم کاتەیە. لەبەر ئەوەی پرسیاری ئەم هاتنەی لێ ئەکەین ئەگەر زۆریان لێ کردبێ بەزوترین کات ماف بۆوەرئەگرین، وەئەگەر کارێکی گێتیی[1] هەبێ هەرچۆنێك بیەوێ بۆی جێبەجێ ئەکەین. وەئەگەر لەبابەت کاروباری وڵاتەوەبێ کەپادشا ناتوانێ بیبەخشێ بەپێی خۆی سزای بۆدائەنێم. وەئەگەر لە بابەت کار و باری گەلەوە بێ لەسەر قسەی ئەو

---

[1] گێتی- دنیایی

سەیری چاکەیان ئەکەم، چونکە زانایان هەمیشە فەرمانیان بە چاکە داوە، بەڵام تێ نەگەیشتوان دژی ئەمە قسە ئەکەن، ئەوا ڕێگامدای کە بەئارەزووی خۆت قسە بکەی.

کە بەیدەبا ئەوەی بیست ترسی نەما، سەری بۆ پادشا دانەواندو لەپاشا ووتی: لە پێشا داوا لە خوا ئەکەم کە پادشا بهێڵێ وەتەختی هەتا سەر بۆ بمێنێ، چونکە لێرەدا چاکەی لەگەڵ من کرد وە شوێنێکی وای پێ بەخشیم کە لەپاش خۆم سەربەرزی بێ لەناو هەمووزاناکاندا وە بەدرێژایی جیهان یادمی پێ بکرێتەوە. هاتنی منیش بۆلای ئەو ئەمەیە کەپەندو ئامۆژگاریەکم لەگەڵ خۆم بۆ هێناوە کە بۆهیچ کەسێك ئەوەم نەبردووە. ئەگەر پادشا ڕێبدا بەووتنی و گوێی لێ ڕابگرێ و کاری پێ بکا، سوودی لێ وەرئەگرێ. وە ئەگەر بەهیچی نەزانێ و گوێی نەداتێ من ئەوەی کەلەسەرم پێویستە ڕامگەیاندووە پادشاووتی: بەئارەزووی خۆت قسە بکە، هەتا لێ ئەبیتەوە گوێت لێ ئەگرم، وەبەپێی ئەوە پاداشتت بۆ دائەنێم.

بەیدەبا ووتی: من زانیومە کە لەجیهاندا ئەوشتانەی کەمرۆڤ جیا ئەکاتەوە لە هەموو زیندەوەران ئەم چوار شتەیە:

تێ گەیشتن، دەروونی پاك، ژیری، دادپەروەری.

هەروەها زانین و وێژەو لێکدانەوە پەیوەندییان بەتێ گەیشتنەوە هەیە. وە بەخشندەیی و شەرمکردن و خۆپاراستن و پیاوەتی پەیوەندیان بە دەروونی پاکەوە هەیە. وە ڕاستی و چاکەو چاودێری و ڕەوشتی باش پەیوەندیان بەداد پەروەریەوە هەیە. ئەم شتانە چاکەن بەڵام دژی ئەمانە خراپەو نەگبەتییە. وە ئەم شتانە لە هەر کەسێك دا

کۆبونەوە لە جیهاندا توشی گیروگرفت نابێ وە لەدوا ڕۆژدا کەم ناکات. زانین و تێگەیشتن گەنجینەیەکن هەرگیز دواییان نایەت، وە خۆشیەکن کە تەواوبونیان نییە، منیش لەبەر ئەوەی کە لەلای پادشا وەستاوم بۆیە بەم قسانە دووام. چونکە پادشایان ئەبێ هەمیشە ڕێزیان بگیرێ.

زاناکان ووتوویانە: هەمیشە بێ دەنگ بە، چونکە ڕزگارت ئەکاو ئەت هێڵێتەوە. وە لە قسەی پڕو پووچ دوور بکەوەرەوە، چونکە پەشیمانی لەدوایە. وە ئەگێڕنەوە کە چوار کەس لە زاناگەورەکان چونە لای پادشایەك ئەویش پێی ووتن: کە هەریەکە قسەیەك بکەن کەبناغەی زانین و وێژەبێ [1].

زانای یەکەم ووتی:- چاکترینی هەموزانینێك بێدەنگییە. دووەمیش ووتی: چاکترینی هەمووشت ئەوەیە کە پیاو شوێن و پایەی خۆی بزانێ چەندە. سێ یەم ووتی: چاکترینی شت ئەوەیە کە پیاو قسە لە کارێك نەکا کەپەیوەندی بەوەوە نەبێ. زانای چوارەمیش ووتی: حەسانەوە لەوەدایە کە پیاو خۆی بدات بەدەست کاری ڕۆژگارەوە.

وە ئەگێڕنەوە جارێك پادشای چین و هیند وئێران و ڕۆم کۆبونەوەو بڕیاریاندا کە هەریەکەیان قسەیەك بکات کە بەدرێژایی جیهان بۆی بنووسرێ. پادشای چین ووتی: من ئەو قسەیەی کە ئەمەوێ بیکەم ئەتوانم نەیکەم نەوەك لە دەمم دەرچێ و دوایی بۆم نەگێڕدرێتەوە. پادشای هیند ووتی: من سەرم لە کەسێك سوڕئەمێنێ کە قسەیەك ئەکا ئەگەر بۆخۆی بێ بەکاری نایەو ئەگەر دژی خۆی بێ لە ناوی ئەبا. پادشای ئێرانیش ووتی: ئەگەر قسەیەکم کرد قسەکە خاوەنی منە،

---

[2] گێتی = دنیایی

بەڵام ئەگەر نەمکرد من خاوەنی ئەوم. پادشای ڕۆمیش ووتی: من هەرگیز لەبێ دەنگیدا پەشیمان نەبومەتەوە، بەڵام کەزۆر قسەم کردبێ هەمیشە پەشیمانی دایگرتووم.

کەوابوو بێدەنگی باشترە لە زۆر ووتن بەتایبەتی لای پادشایان! وەپیاو ئەبێ زمانی خۆی بگرێ. بەڵام پادشا خوا ئاگاداری بێ کەڕێی دامێ بەقسەکردن، ئەبێ نیازی خۆمی پێ بڵێم، بەڵکو سوودی لێ وەربگرێ وەمن ئامانجم چاکەی دووا ڕۆژەو لەسەرمە کەبیڵێم و ئەڵێم: ئەی پادشا تۆ لەوڵاتی باوك و باپیرتای کەئەم ووڵاتەیان دامەزراند، وە ئاوەدانیان کردووەو لە شکرو سوپایان ڕێکخست و ئەم ووڵاتەیان پێ گەورەکرد کەتۆ هێشتا لە دایك نە بووبووی، وە بەخۆشی و کامەرانی ڕایان ئەبوارد لەگەڵ ئەوەشدا بەنەرمی و دڵسۆزی لەگەڵ هەموو کەسێکدا ئەجوڵانەوە. لەبەر ئەوە لەپاش مردنیان کەس بەخراپە ناوی نەبردن. ئێستەش تۆ لە جێگەی ئەوان دانیشتووی وەهەمووشتێکی ئەوان لە کاروباری سەربازی و سەرباز کەوتە دەستی تۆ، بەڵام تۆماڨ گەلت خستە پشت گوێ و خۆت لێ بایی بوو، وەڕەوشتت تێکچوو وە خراپەت لێ بڵاو بووە. منیش ئەڵێم ئەی پادشا چاکتر وایە کە تۆ ڕێگای باوك و باپیرت بگری و لەگەڵ ئەم گەلەی خۆتا بەچاکی بجوڵێیتەوە، بۆئەوەی لەدوای خۆت بەچاکە باست بکەنو بەخراپە ناوت نە هێنن. بەم جۆرە ووڵاتەکەت ئەمێنێتەوە ئەوەش بزانە ئەی پادشا کە پیاوی بێهۆشی لەخۆ بایی ئەوکەسەیە کە هەمیشە توندو تیژە و لە کاروباری خۆیدا دڵ خۆشەو گوێ ناداتە قسەی کەس، بەڵام پیاوی ژیری نەبەرد کەسێکە کە بەژیری و هێمنی کاری خۆی ئەباتە

سەر. باش سەرنج لەم قسانە بدە ئەی پادشا وەبەلاتەوە گران نەبێت. ئەوەش بزانە من لەبەر ئەوە ئەم قسانەم نەکرد کەشتێکم پێ ببەخشیت، بەڵام ئامۆژگاریم کردیت و بەزەیم پیاتا هاتەوە.

کەبەیدەبا قسەکەی تەواو کرد پادشا تووڕەبوو ووتی: ئەی بەیدەبا قسەیەکت کرد کە هەتا ئێستا لەم وولاتەدا هیچ کەسێك نەی کردووە نازانم تۆ چۆن وێرات لەگەڵ ئەم کەم هێری و پایە بچوکیەتدا، من سەرم لە هاتنت سوڕما، بەڵام تۆ بەزمانت خۆت بەسەرما زاڵکرد بەجۆرێك کە لە ئەندازە تێ پەڕی لەبەر ئەوە لە سزادانی تۆ چاکترم دەست ناکەوێت کە جارێکی تر هیچ کەسێك نەتوانێ کە بەم جۆرە قسە لەگەڵ پادشایاندا بکات. وە بۆئەوەی کەببیت بەپەندێك بۆئەوانەی وەك تۆن. لە پاشا فەرمانیدا کەبیدەن لەسێ دارە. بەڵام دوایی ووتی جارێ بیخەنە بەندیخانەوە. کە گرتیان پادشا فەرمانیشی دەرکرد بۆ قوتابییەکانی، وە ئەوانەی کەلەگەڵیدا کۆئەبونەوە. ئەوانیش ڕایان کردو لە دورگەی[1] دەریاکان(٢) دا خۆیان شاردەوە.

بەیدەبا چەند ڕۆژێك لە بەندیخانەدا مایەوە کەس لە ترسی پادشا باسی نەئەکرد.

هەتا شەوێك پادشا خەوی زڕا، چاوی بڕیبووە ئاسمان و بیری لە گەڕانی ئەستێرە ئەکردەوەوخۆی بەوەوە خەریك کردبوو. لەوکاتەدا بەیدەبای هاتەوە بیر، وە ئەوقسە ناخۆشانەی کە لەگەڵیدا کردی و هەمووی هاتەوە یاد. زۆرپەشیمان بووەوەو لەبێ هۆشی ڕزگاری بوو

---

[1] دورگە = جزیرە

لەدڵی خۆیدا ووتی: کارێکی خراپم کرد بەرامبەر بەم فەیلەسووفە، زاناکان ووتویانە: چوارشت هەیە کەنابێت لە پادشادا هەبێت.

یەکەم: تووڕەیی، چونکە کینە ئەخاتەوە و پیاو ڕیسوا ئەکا.

دووەم: ڕەزیلی، چونکە بەچاکە باسی ناکەن بەتایبەتی ئەگەر هەژار نەبێ.

سێیەم: درۆ کردن، چونکە کەس نابێ بە هاوڕێی.

چوارەم: قسەی ڕەق، کە لەبێ مێشکی و نەزانین خراپترە. من پیاوێك هاتە لام و ئامۆژگاری کردم کەچی بە خراپە پاداشتم دایەوە.

لەپاشا فەرمانیدا کەبیهێنن، کەهات پادشا لێی پرسی: ئەی بەیدەبا لە قسەکانتدا خۆنیازت سووککردنی من نەبوو؟ بەیدەبا ووتی: ئەی پادشای گەورە ئەوەی من بەتۆم ووت سودی خۆت و گەلەکەتی تیابوو. پادشا ووتی: ئێستا ئەبێ قسەکانت هەمووی بکەیتەوە هیچی بەجێ نەهێڵی.

بەیدەبا دەستی کرد بە هۆنینەوەی قسەکانی. پادشاش گوێی ڕاگرتبوو وەهەر کە شتێکی لێئەبیست زەوییەکەی بەردەمی چاڵ ئەکرد بەشتێك کەبەدەستیەوە بوو.

لەپاشا سەری بەرزکردەوەو فەرمانی کرد کە دابنیشێ وە پێی ووت: ئەی بەیدەبا قسەکانتم بەلاوە زۆرجوان بوو، وەکاری لێ کردم ئیتر تۆهەرچی بڵێی من وائەکەم. لەپاشا فەرمانی کرد پێوەندیان کردەوەو دیارییەکی جوانی دایە. ئەویش بە سوپاسەوە وەری گرت و ووتی: ئەی پادشا ئەوقسانەی کە من بەتۆم گەیاند جگە لەوانە هیچ بەکاری تۆنایە. پادشا ووتی: ڕاست ئەکەی ئەی زانای تێگەیشتوو. ئەوا تۆم

کرد بە سەرۆك وەزیری ئەم گەلە. بەیدەبا لە پێشدا داوای کرد کەلێی ببورێت ووتی: ئەم کارە هەر بەتۆئەکرێ ئەی پادشا. پادشاش لێی خۆش بوو کەبەیدەبا رۆشت پاشا ناردی بەشوێنیداو پێی ووت: من ئەزانم ئەم کارە بەتۆ نەبێ بەکەسی ترناکرێ لەبەر ئەوە ئەبێ وەری بگری، ئەویش وەریگرت وەبوو بە سەرۆك وەزیر. کڵاوی زێڕیان کردە سەر. وەلەسەر ڕەوشتی ئەوکاتە بەناو شاردا گێڕایان. لەپاشا لەبارەگای [1]دادگادا دانیشت ماف لە زۆردار ئەسەند وە بەچاوێکی یەکسان سەیری دەوڵەمەندو هەژاری ئەکرد. وەگەلێ یاسای[2] بەکەڵکی داناوماڵێکی زۆری بەخشی. قوتابیەکانی لە هەمووڵایەکەوە هاتنەوەو زۆرسوپاسی خوایان کرد بەرامبەر بەم سەرکەوتنەی (بەیدەبا) لە چارەکردنی ڕەوشتی پادشای هیند (دەبشەلیم). وە ئەو ڕۆژە بوو بە جەژنێك کە هەتا ئێستا ئەی گێڕنەوە.

لەپاشا بەیدەبا لە کاتی بێ ئیشیدا کتێبی رامیاری زۆر وردی دانا کەپادشا لەسەری ئەڕۆیشت و کاری پێ ئەکرد لەبابەت کارو باری گەلەوە.

بەم جۆرە پادشاکانی دراوسێی بوون بەدۆستی. وە گەل شاد بوو کەبەو جۆرە پادشا وازی لە ڕەوشتە کۆنەکانی هێنا، کەوتە چاکەو دادپەرستی.

لەپاشا بەیدەبا قوتابیەکانی کۆکردەوەو ڕێزی گرتن و چاکەی لەگەڵدا کردن و پێی ووتن: ئەزانم کە چومە لای پادشا ئێوە بە گەوجتان ئەزانیم، وە ئەتان ووت: بەیدەبا سەری لێ تێکچووە کە

[1] لەبارەگای دادگادا — شوێنی مەحکەمە

[2] یاسا -- قانون

ئەچێتە لای ئەم پادشا زۆرداره. بەڵام من لە زانایانم بیستووە کە پادشایان جۆرە مەستییەکیان لەگەڵدایە وەك مەستبوونی مەی [٢] وایە. وە بەهۆی پەندو ئامۆژگاری زانایانەوە نەبێ ڕزگاریان نابێ لەو مەستییە. هەر لە بەر ئەوەیە کە پادشایان ئەبێ گوێ لە قسەی زانا بگرن. وە لەسەر زاناش پێویستە کە ڕەوشتی پادشا ڕاست بکاتەوە و بیخاتە سەر ڕێی ڕاست بەئامۆژگاری و پەندی بەرز. هەر لەبەر قسەی زاناکان بوو کە ووتوویانە: لەسەر زانا پێویستە کە پادشا لە خەوی بێهۆشی ئاگادار بکاتەوە وەك پزیشك کە هەتا ئەتوانێ ئەبێ باش نەخۆش دەرمان بکات. منیش حەزم نەکرد کە لە پاش ئێمە بە خراپە ناوم ببرێ‌و پێم بڵێن بەیدەبای فەیلەسوف لەکاتی دەبشەلیمی زۆرداردابوو، بەڵام نەیتوانی بیخاتە سەر ڕێی ڕاست وە ئەگەر کە سێك پێیان بڵێ: لە ترسی گیانی خۆی نەی وێراوە، ئەیان ووت:

بالەدەستی ڕای بکردایەو نیشتیمانی بەجێ بهێشتایە. نیشتیمان بەجێ هێشتنیش ستەمە، لەبەر ئەوە وام بەچاکزانی کە گیانی خۆم بەخت بکەم یان بگەم بە ئامانج لەم ڕێیەدا. چونکە زاناکان ووتوویانە: کەس ناگاتە پایەیە کی بەرز بەسێ شت نەبێ: بە هەوڵێکی زۆر، یان بە لەناو بردنی ماڵ، یان ئاوارەبوون لە ڕێی ئایندا، ئەوەی کە ئازار نەکێشێ ئارەزوو ناچێژێ. وە پادشا دەبشەلیم فەرمانی پێکردووم کە کتێبێکی بۆ دابنێم کەپڕبێ لە پەندو ئامۆژگاری و هونەری بەرز. لە بەرئەوە ئەمەوێ کە هەریەکە لە ئێوە شتێك دابنێ لە بابەت هەر وێژەو

---

[٢] مەی – شەراب

هونەرو زانینێك كە خۆی ئەیزانیێ بۆئەوەی تیێ بگەم كە هەریەكە لە ئێوە پلەی زانینی چەندە.

قوتابیەكان وتیان: ئەی زانای گەورە ئەوەی بە تۆدراوە لە زانین و تێگەیشتن و ڕەوشت هەرگیز بەئێمە نەدراوە. تۆ گەورەی ئێمەی، وە ئەگەر شتێك بزانین بەهۆی تۆوەیە. وە ژیانی ئێمە لە دەستی تۆدایە بەلام ئێمەش خۆمان ماندووئەكەین. پادشاش هەر لەسەر ئەو ڕێیەی كە بەیدەبابۆی دانابوو مایەوە وەكە وولاتەكەی بەتەواوی جێگیر بووترسی دوژمنانی نەما سەیری ئەوكتێبانەی ئەكرد كەزاناو فەیلەسوفەكانی هیند بۆ باوك و باپیریان دانابوو ئەویش حەزی كرد كەكتێبێكی وای هەبیێ كە بەناوی خۆیەوە دانرابێت، كە لە بابەت ڕۆژانی ڕا بوردوویەوە بدویێ. وە ئەوەشی زانی كە ئەمە بە "بەیدەبا" نەبیێ بەكەسی ترناكریێ لەبەرئەوە پێی ووت: ئەی بەیدەبا تۆفەیلەسوفی گەورەی هیندی، من سەیری گەنجینەكانی پادشایانی هیندم كردووە كە هەریەكەیان كتێبێكی تایبەتی خۆی هەیە كە لە بابەت ڕۆژانی خۆی و گەلەكەیەوە ئەدویێ.

وە من ئەترسم بمرم و كتێبێكم نەبیێ كەلەدوای خۆم یادمی پیێ بكرێتەوە وەلەبەرئەوە حەزئەكەم كەكتێبێكی نایابم بۆدابنێیت وەبە هەموو زانینتەوە كاری تیا بكەی، دیوی دەرەوەی ڕامیاری و سودی گەلی تیابیێ، وەناوەوەی ڕەوشت و ڕامیاری پادشا بیێ بەرامبەر بەگەل، كە بەهۆی ئەوەوە خۆم و گەلەكەم لەزۆرتەنگو چەڵەمە ڕزگارمان ببێت، وە لەدوای خۆم ساڵەهای ساڵ بمێنێتەوە، كە (بەیدەبا) ئەوەی بیست سەری بۆخستە سەر زەویو لەپاشان ووتی: ئەی پادشای گەورە ئەستێرەی تۆ ڕوویكردە بەرزی وەنەگبەتی بەری دای، وەڕۆژت درێژ

بوو، چونکە زانین و ژیری پادشا ئەباتە سەر بەرزترینی پلە، خوا بتهێڵی بە خۆشی هەر فەرمانێك ئەکەیت سەرم لەڕێتە. پادشا ووتی: تاقیمکردیتەوەو زانیم کە کاری پادشا بەتۆئەکرێ. ئەمەوێت کتێبەکەم تێکەڵبێت لەزانین و پەندو گاڵتەو گەپ.

بەیدەبا ووتی: ئەوا بڕیارمدا کە ئەوە دابنێم. وە لەگەڵ پادشادا ڕێککەوتن کە بەماوەی ساڵێك بۆی دابنێ، پادشاش خەڵاتی کرد.

بەیدەبا ماوەیەك مایەوەوبیری لەوە ئەکردەوە کە کتێبەکە چۆن دابنێ وەچۆن دەستی پێ بکات. لەپاشا قوتابییەکانی کۆکردەوەو پێی ووتن: پادشا داوای کارێك ئەکا کە شانازی ئێمەو ووڵاتمانی تێدایە. بەم جۆرە لە بابەت کتێبەکەوە دووا کە چۆنی دابنێ هەتا پادشا دڵخۆش بکات. قوتابییەکان هەرچەند بیریان کردەوە نەیانتوانی کە چارەیەك بۆ ئەم کارە بدۆزنەوە. کەبەیدەبا تێ گەیشت قوتابیەکانی ناتوانن. لە دڵی خۆیدا ووتی: کەشتی لە دەریادا بە کەشتیوان ئەڕوا، چونکە لە کاتی خواربوونەوەیدا ڕاستی ئەکەنەوە، بەڵام سەرۆکی کەشتییەکە بەتەنها ڕێی باش بۆ کەشتییەکە ئەدۆزێتەوە کە بەناو شەپۆلی سەختی دەریادا ئەڕوا. وەهەرکاتێ کەپڕ بوو لە سوارو کەشتیوانی زۆر سەرۆکەکە دڵنیانابێ لەوەی کەکەشتییەکە نوقم نەبێ و هەموو لە ناو نەچن. بەم جۆرە بەیدەبا خۆی بیری کردەوە لە دانانی دەرگای یەکەمی کتێبەکە کە هەتا توانی دایبنێ لەگەڵ یەکێك لە قوتابیە باوەڕ پێکراوەکانی خۆی لەگەڵ چەند پارچە کاغەزێك کەلەو کاتەدا بەکار ئەهێنرا. وەهەندێك خۆراك کە بەشی ئەوماوەیە بکات. لەپاشان دەرگاکەیان لە سەرخۆیان داخست. بەیدەبا ڕێکی ئەخست و

قوتابیەکەی ئەی نووسی. وە خۆی دووبارە پیادەچوەوە هەتابەتەواوی جێگیربوو، وە نوسرایەوە. لەم کتێبەدا چواردە بەشی ڕێکخست کە هەریەکە لەوی تر جیاواز بوو. وە لە هەر بەشێکدا پرسیارو وەلامی ڕێکخست کەئەوەی سەیری بکا کەلکی لێ وەربگرێ. وەئەم بەشانەی کرد بەیەك کتێب و ناوی نا (کتێبی کەلیلەودیمەنە). کەلەسەرزمانی دڕندەو باڵندەو گیانەوەرانیتر ڕێکی خست، بۆ ئەوەی کەهەمووکەسێك بە دەرەودی قسەکان گاڵتەوگەپی دەست بکەوێ. وە ناوەرۆکی قسەکانیش زانایان مێشکیان پێ زاخاوبدەن. هەروەها ڕازاندیەوە بەوەی کە پیاو کەلکی لێ وەر ئەگرێ لە کاروباری خۆی وکەس وکاری ودانیشتوانی وولاتەکەی.

وە کاروباری ئاینی و دواڕۆژ. وەهەرچی پێویستی هەیە. وە پیاوفێری ئەوە ئەکات کە چۆن ئەبێ گوێڕایەڵی پادشایان بێت ، وەچ کاتێك لێیان دوور بکەوێتەوە. بەم جۆرە کردی بەکتێبێکی زۆرنایاب کەپیاولەدوولاوە کەلکی لێوەرئەگرێ. باسی گیانەوەران وگاڵتەو گەپ. وە قسەکانیان بۆ پەندو ئامۆژگاری: وە دەست پێکردنی کتێبەکە لە بابەت هاوڕێیەتییەوە ئەدوێ کە چۆن دووخۆشەویست بەفێڵی دووزمانی لەیەك ئەڕەنجێن بەوجۆرەی کە پادشا فەرمانی کردبوو بەیدەبا بەقوتابییەکەی ئەووت ئەویش ئەینوسی لە فەلسەفەو گاڵتەو گەپ. وەبەیدەبا ئەڵێ: هەرکاتێك زانین قسەی نوسەرانی زۆری تێکەڵ بوو تێك ئەچێ وبەکار نامێنێ. بەم جۆرە لەگەڵ قوتابییەکەیدا بیریان ئەکردەوە هەتاگەیشتنە ئەوەی کە قسەکانیان لەسەر زمانی دوو چوارپێ بێت وەبەمە شوێنی گاڵتە و گەپیان دەست کەوت. وەبە قسەکانیان شوێنی پەندو ئامۆژگارییان دەست کەوت. هەر لە

بەرئەوەبوو کە زانایان و تیٚ گەیشتوان گوێیان لە پەندە بەرزەکانی ئەگرت و وازیان لە گیانەوەروگاڵتە و گەپ ئەهێنا.

بەڵام نەزان و تێنەگەیشتوو وازیان لە پەندە بەنرخەکانی هێنا و بەلای گاڵتەوگەپدا لایان کردەوە. وە سەریان لەقسەکردنی ئەم دووچوار پێیە سوڕما. وەئەوەیان نەئەزانی کە ئەمە لە بەر ئامۆژگاری و زانینە کە لە سەرزمانی ئەمانە دانراوە کە قسەناکەن. چونکە بەیدەبا هەندێك ئامانجی لە دەرگای یەکەمی کتێبەکەدا هەیە کەتیٚمان ئەگەیەنیٚ کە پیاوی دووزمان دۆست و برادەر لەیەك ئەکا لەبەر ئارەزووی خۆی. لەبەر ئەوە ئەبیٚ ئاگاداری خۆیانبن و گویٚ لە قسەی دووزمان ڕانەگرن.

بەم جۆرە بەدیەباو قوتابیەکی مانەوە هەتا کتێبەکەیان بەماوەی ساڵیك تەواوکرد.

کە ساڵەکە تەواو بوو پادشا ڕای سپارد کە پێی بڵێن ساڵەکە تەواو بوو چیتکرد؟

بەیدەبا وەڵامی بۆ ناردەوە کەکتێبەکەم تەواوکردووە، باپادشا فەرمان بدات بەدانیشتوانی شار کۆببنەوە هەتا بۆیان بخوێنمەوە پادشا زۆری پێخۆش بوو. وە دانیشتوانی وولاتەکەی لە دورونزیکەوە بانگ ئەکرد بۆگوێگرتن لەخوێندنەوەی کتێبەکە. وەلەو ڕۆژەدا کەدایاننابوو گشتیان کۆبونەوە. وەپادشا فەرمانیدابوو کە تەختیٚ وەك تەختەکەی خۆی بۆ ( بەیدەبا) ڕێکبخریٚ. وە کورسی بۆ زانایان و شازادەو گەورە پیاوان ڕیز کرابوو. بەیدەباش ئەو بەرگەی لەبەر کردبوو کە پێوەی ئەچووە لای پادشایان. کتێبەکەش بەسەر دەستی قوتابیەکەیەوەبوو، دانیشتوان لە هەموولایەکەوە لەبەری هەستان.

پادشاش هەستاو سوپاسی کرد. (بەیدەبا) سەری بۆ پادشا خستە سەر زەوی‌و سەری بەرزنەکردەوە پادشاووتی: سەرت بەرز بکەرەوە ئەمڕۆ ڕۆژی خۆشی‌وحەسانەوەیە ئەی(بەیدەبا). کاتێك کەدانیشت بۆخوێندنەوەی، پادشا لەبابەت مانای هەمووبەشێکەوە مەبەستی لەوەدا پرسیاری لیَ ئەکرد. ئەویش تێی ئەگەیاند. بەم جۆرە پادشا زیاتر سەری سوڕئەما و زیاتر دڵی خۆش ئەبوو. کە بەیدەبا کتێبەکەی تەواو کرد، پادشا ووتی: ئەی بەیدەبا هەرپادشایی نەبیَ داوای چی ئەکەی باپێتی ببەخشم. بەیدەبا داوای کامەرانی پادشای لەخواکرد ووتی: ئەی پادشا من ئیشم بەماڵ نییە. وە لەم جلانەی خۆشم زیاتر لەبەر ناکەم.

بەڵام داوای یەك شت لە پادشا ئەکەم ئەویش ئەوەیە کە فەرمانبدەی ئەم کتێبەت بۆبنوسنەوە و پارێزگاری تەواوی بکەی، وە نەیەڵی کەلە (خانەی زانست)بچێتە دەرەوە، چونکە ئەترسم لەووڵاتی هیند دەری بکەن وەبەتایبەتی لەدانیشتوانی ئێران ترسم هەیە کە ئەگەرپێی بزانن ئەیبەن. پادشا پەیمانی دایە کەئەوکارەبکات. لەپاشابانگی قوتابیەکانی کردو خەڵاتی کردن.

لەپاش ماوەیەك کیسرا (ئەنو شیروان) بوو بە پادشای ئێران وەزۆرحەزی لە کتێبی زانین ئەکرد. بەوەی زانی کەواکتێبێکی گەورەو بەناوبانگ لە هیند هەیە خۆی بۆنەگیرا هەتا برزەوەی پزیشکی بۆنارد. ئەویش چوو لەویَ نەهاتەوە هەتا لەووڵاتی هیند دەری هێناو بردی خستیە ناو گەنجینەکانی ئێرانەوە.

**دەرگای پێشەکی کتێبەکە تەواوبوو.....**

# دەرگای ناردنی برزەوی

## بۆ وولاتی هیند

خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی زیندەوەرانی دروست کرد. وە بە گەورەیی خۆی ژیانی پێبەخشین. وەچاکترین شتێك لەژیاندا کە داوێتی بە زیندەوەر ژیرییە کەسەری هەموو کارو بارێکە لە جیهان و دوا ڕۆژدا. وەهۆیەکی گەورەیە بۆ هەمووچاکەوخۆشیەك. ژیری بە مەشق و تاقیکردنەوە پەرەئەسێنی کەلەدەمێکەوە لە ئادەمیزاددا هەیەو شاراوەیە وەك ئاگری ناو (بەردە ئەستێ) وایە کە دەرناکەوێ هەتا یەکێك لێی نەدا. کە لێیدرا پرشنگی ڕوناکییەکەی دەرئەکەوێ، هەروەها ژیری لە مەردمدا شاراوەیە و دەرناکەوێ هەتا مەشق دەری نەخات و تاقیکردنەوە بەهێزی نەکات. وە ئەوەی کە خاوەنی ئەوبێ لەجیهاندا ئەگا بە ئامانج و لە پاشەڕۆژدا ئەچێتە ڕیزی پیاو چاکانەوە.

وەکو ئەگێڕنەوە پادشای ئێران "ئەنوشیروان" خوا ژیرییەکی گەورەی پێ بەخشیبوو وە زانستێکی زۆری هەبوو کەهیچ پادشایەك لەپێش ئەودا پێی نەگەیشتووە. جارێك پێیان ووت کەلەولاتی هیند

کتێبێك هەیە کە سەرچاوەی هەموو هونەرو زانینێکە. لەبەر ئەوە فەرمانی کرد بۆسەرەك وەزیرەکەی کەناوی (بوزور جەمهیر)بوو کە زانایەکی بۆ پەیدابکات کە زمانی فارسی و هیندی بە باشی بزانێ. وە لە شوێنی فەلسەفەو زانین بگەڕێ. ئەویش سەرەك پزیشکانی ئێرانی بۆ دۆزیەوە کەناوی (برزەوی )بوو. کەبرزەوی چووە لای پادشا سەری دانەواند و لە بەردەمیدا ڕاوەستا پادشا پێی ووت: ئەی برزەوی من تۆ هەڵبژاردووە بەوەی کە زانیومە پیاوێکی لێهاتووی وەهەمیشە هەوڵی زانین ئەدەی. وەکو بیستومە لەهیند کتێبێك هەیە کە لەگەنجینەی پادشاکانیاندا پارێزگاری کراوە. وەهەرچی بیستبوو لەو بابەتەوە بۆی گێڕایەوە. لەپاشا پێی ووت: خۆت ئامادەبکە ئەتنێرم بۆخاکی هیند بۆهێنانی ئەوکتێبە، چونکە ئەمە سودی خۆت و گەلەکەتی تێدایە. وەهەر کتێبێکی باشی تریشت دەستکەوت بیهێنە، وەلەپارە مەترسە هەرچی زێڕی من هەیە لەڕێی تۆدا دایئەنێم. لەپاشان ڕۆژێکیان بۆدانا کە بڕوا. وە دە چەرم پارەی دایە کە هەریەکە دە هەزار لیرەی تێدابوو.

کە برزەوی گەیشتە هیند لەوێ ئەگەڕا لە کۆڵانان و بازاڕدا. وە بەلایماڵی پادشادا تێئەپەڕی و پرسیاری ماڵی پیاوەزاناکان و فەیلەسوفەکانی هیندی ئەکرد. وە ئاگاداری ئەکردن کەئەوپیاوێکی بێگانەیە هاتۆتە هیند وەبەشوێن زانیندا ئەگەڕێ. وەپێویستی بە یارمەتیدانی ئەوان هەیە. بەم جۆرە بوبەدۆستیان و هات و چۆی ئەوانی ئەکردو زانستی لێ وەرئەگرتن، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی لەو زانستانەدا شارەزابوو، بەڵام واخۆی نیشان ئەدا کەهیچ نازانێ.

ئەوەندە مابوەوە دۆست و هاوڕێی زۆری پەیدا کردبوو لە هەموجۆرە چین و پیشەسازییەك. لەو برادەرانە پیاوێکی هەڵبژاردبوو بەهاوڕێی خۆشەویست کە پاسەوانی گەنجینەی پادشابوو وەکلیلی گەنجینەکان بە دەست ئەو بوو. وە لەزۆرکارو باردا پرسی پیٚ ئەکرد، بەڵام ئەو ئامانجەی کە بۆی هاتبوو هێشتا پێی نە وتبوو بۆئەوەی کەتاقی بکاتەوە ئایا بە کاری ئەوەیەت کە پێی بڵێت یان نەء؟ ڕۆژێك پێی ووت: برا من ئەمەویٚ ئەو نیازەی لێم شاردوویتەوە پێت بڵێم. وە بزانە کەمن لەبەر کارێك هاتومەتە هیند. پیاوی ژیر سەیری هەرکەسێکی کرد ئەزانیٚ کەچی لە ژێر سەردایە. پیاوە هیندیەکە ووتی: ئەزانم بۆچی هاتووی، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دۆستی منی حەزم نەئەکرد پرسیارت لیٚ بکەم، بەڵام ئێستا ئەتەویٚ کەدەری بخەی کەوا من لە پێش تۆدا بۆتی دەرئەخەم: تۆبۆ بردنی کتێبی "کەلیلە و دیمنە"هاتووی کە بەنرخترین شتی ئێمەیە، وە ئەتەویٚ کە بەوە پادشاکەت دڵخۆش بکەیت. وە بە فێڵ هاتووی بۆ ئەم وڵاتە، بەڵامن کە تۆم ئەوەندە بە ئارام و لە سەرخۆ کە هەرگیز قسەیەکت هەڵە نەکرد. وە ئەم نهێنیەی خۆت بە کەس نەوت کە زۆر دەمێکە لێرەی، لەبەر ئەوە دۆستایەتیم لەگەڵ تۆدا بەهێز کرد. من پیاوی وەك تۆم نەدیوە بەم جۆرە. زاناکان ووتوویانە: ژیری ئادەمیزاد لە هەشت کاردا دەرئەکەویٚ:(بەزەیی، خۆناسین، ڕازی کردنی پادشا، زانینی ئاشکراکردنی نهێنی لای هاوڕێی زمان نەرمی، پاراستنی نهێنی، پاراستنی زمان، وە لەخۆوە وەڵام نەدانەوە).

ئەم ڕەوشتە باشانە هەمووی لە تۆدا هەیە، خوا هەر بتهێڵێ و هەر سەرکەوتوبی، هەرچەندە هاتووی گەوهەرە بەنرخەکەمان ببەی بەڵام تۆ ماڧ ئەوەت هەیە.

برزەوی ووتی: من گەلێ قسەم ئامادە کردبوو کە بیکەم بەڵام کەتۆ نیازی منت دەرخست ئیتر بە کورتی ئەڵێم: من کارم بەیارمەتیدانی تۆ هەیە، چونکە گفتوگۆکردن لەگەڵ زانادا و باسی نهێنی لەلای فەیلەسوف و تێگەیشتوو پیاو ئەگەیەنێ بە ئامانج. وەنهێنیەکەی هەر ئەمێنێ وەك مانەوەی شتێك لە ناو قەڵایەکی قایمدا.

پیاوە هیندیەکە ووتی: هیچ شتێك نییە بگاتە خۆشەویستی. پیاو ئەتوانێ لەگەڵ هاوڕێی ڕاست و پاکدا باسی نهێنی خۆی بە ئاشکرا بکات وە پاراستنی نهێنی گەورەترین ڕەوشتی باشە. بەڵام هەرچەندە ئەو کەسە ڕاست و دڵپاك بێ ترسی بڵاوکردنەوەی نهێنی هەر لێ ئەکرێ هەرچەندە کە بڵاویشی ناکاتەوە. وەهەرگیز نهێنی دووکەس ئاشکرانابێ، بەڵام کەیەکێکی تر ئاگاداربوو لێیان ئیتربڵاو ئەبێتەوە وەخاوەنەکەی ناتوانێ بیشارێتەوە وەك هەور کەلە ئاسماندا بڵاو بوەوە، وەئەگەر یەکێك ووتی ئەمە هەوری بڵاوە کەس ناتوانێ بەدرۆی بخاتەوە، منیش ئێستاتۆم لە هەمووکەسێك خۆشتر ئەوێ. بەڵام ئەم کارەی کە لەمنت ئەوێ نهێنیەکە کە هەرگیز داناپۆشرێ. ئەوکاتە کەئاشکرابوو من لەناو ئەچم. چونکە پادشاکەمان زۆردڵ ڕقە لەسەر کەمترین گوناە سزای گەورە ئەدا. ئیتر من چۆن ئەتوانم ئەم گوناهە گەورەیە بکەم کە پێیان زانیم دۆستایەتی تۆ سزام لەسەر لانابات. برزەوی ووتی زاناکان باسی

گەورەیی هاوڕێیەك ئەكەن كە نهێنی بشارێتەوەو هاوڕێكەی سەر بخات، وە ئەم كارەی كە من بۆی هاتووم پشتم بە تۆ بەستووە، هیچ مەترسە هەتا بمێنم ناوی نابەم، بەڵام خۆت لە منالەكانت و كاربەدەستانی پادشا بپارێزە. وەهیوام وایە كە هەرگیز ئەم نهێنییە بڵاونەبێتەوە، چونكە من ئەڕۆم و تۆ لێرەی وەهاوڕێی سێهەم لە ناوماندا نابێت، بەمجۆرە ڕێككەوتن و پەیمانیان لە یەكتر سەند.

كابرا كتێبی "كەلیلەو دیمنە"ی بۆهێنا لەگەڵ چەند كتێبێكی تردا.

برزەوی دەستی كرد بەگۆڕینی كتێبی كەلیلەودیمنە لە زمانی هیندییەوە بۆفارسی شەوو ڕۆژ خەوو خۆراكی لە خۆی كردبوو. زۆر ئەترسا لەناكاو پادشای هیند داوای كتێبەكەبكات یان لە گەنجینەكەدا نەی بینێ. كەتەواوی كرد نامەی بۆ ئەنوشیروان نووسی كە كتێبەكەم بە تەواوی گۆڕیوە. ئەویش زۆری پێ خۆش بوو وە نامەیەكی بۆنارد كە دەستبەجێ بگەڕێتەوە.

برزەوەی كە هاتەوە بۆ ئێران پادشا سەیری كر كەوا ڕەنگی تێكچووەو زۆریش ماندووە. فەرمانیدا كە حەوت ڕۆژ بحەسێتەوە. لە پاشا فەرمانی كرد كە زانایان و پیاوە گەورەكان كۆببنەوە. برزەوی بانگ كرد لەگەڵ ئەوكتێبانەی كە لە هیند هێنابونی. كە برزەوی ئەو كتێبانەی خوێندەوە زۆریان پێخۆش بوو. وە سوپاسی خوایان كرد بەو زانینەی كەپێی بەخشین. وەسوپاسی برزەوییان كرد. پادشاش فەرمانیدا كە دەرگای گەنجینەی زێڕوزیوو یاقووت بكەنەوە بۆ برزەوی، وە پێی ووت: ئەی برزەوی من تۆم كردووە بە سەرۆكی

پیاوە گەورەکانی وولاّت، ئەبیّ کلاّوی زێڕ لەسەر بکەی وە لەسەر تەختێك وەك تەختەکەی من دابنیشی. برزەوی سەری دانەواند و ووتی: خوا پادشا بهێڵیّ، من ماڵم ناویّ، بەلاّم لەبەر دڵی پادشا شتێك هەڵئەگرم. لەپاشا چوو دەستیّ جلی نایابی هەڵگرت وەسوپاسی پادشای کردو ووتی: لەسەر پیاو پێویستە کە چاکەیان لەگەڵ کرد سوپاس بکا هەرچەندە کەئەوەی بەماندوبونی خۆی دەست کەوتبیّ. وە ئەمە کارێك بوو کە خۆشی پادشای تیادا بوو. من هەر چەندە کە سزام کێشا بەلامەوە هیچ گرنگ نییە چونکە کامەرانی و گەورەیی ئێوەی تیایە ئەی تێگەیشتوان. بەلاّم من داوای یەك شت ئەکەم کە ئەویش ئەوەیە کەپادشا فەرمان بکا بەوەزیرەکەی کە (بوزور جەمهیر کوڕی بەختەکانە) خۆی ماندو بکات و ووتارێکی جوان لەبابەت ژیانی منەوە بنوسیّ و بیکاتە بەشێك. وە بیخاتە پێش دەرگای (شێروگا) کەدەستپێکردنی کتێبەکەیە. ئەنوشیروان ڕویکردە وەزیرەکەیی و پێی ووت: خۆت دەزانی کە برزەوی لەبەر ئێمە چەند سزای کێشا وەخوا بەهۆی ئەوەوە چۆن فێری گەلیّ زانینی کردین ئێمە ئەبیّ شانازی پێوە بکەین. ئێستەش داوای ئەم پێویستییە ئاسانە لە ئێمە ئەکات. دەمەویّ وتارێکی بەنرخی لە بابەت تەواوی ژیانیەوە هەتا ئەوکاتەی کتێبی کەلیلەو دیمنە لەهیند ئەنوسێتەوە بە جۆریّ کە خۆی پەسەندی بکا بۆی بنوسی و بیکەی بەدەرگایەك لەپێش کتێبەکەدا کەخوێندەواران بیخوێننەوە، لەپاشا ئاگادارم بکە، ئەمەش گەورەییە بۆتۆ.

بوزور جەمهیر سەری دانەواندو ووتی: خوا بتهێڵێ ئەی پادشا کە سەری منت بەرز کردەوە. لەپاشان بوزورجەمهیر دەستی کرد بە نووسینی ووتارێك لە بابەت ژیانی برزەوییەوە، وە هیچی نەهێشتەوە لەڕەوشت و زانین و کردەوەی، هەمووی نووسی وەبەشێوەیەکی زۆر نایاب دەری هێنا وەخستییە پێش بەشی (شێروگا) کە بەشی یەکەمی کتێبەکەیە. وەپادشای ئاگادارکرد. ئەویش زانایان و پیاوە گەورەکانی شاری کۆ کردەوە. بوزور جەمهیر وتارەکەی خوێندەوە. پادشا زۆردڵی خۆش بوو، وەهەموو سوپاسی وەزیرەکەیان کرد وەپادشا ماڵێکی زۆری پێبەخشی، بەڵام دەستە جلێکی نایاب نەبێ هیچی وەر نەگرت.

برزەویش هەستا دەستی بوزور جەمهیری ماچ کردو ووتی: زۆر سوپاست ئەکەم وەسوپاسی پادشا ئەکەم کە منی سەر بەرز کرد بە نوسینی ئەم ووتارە لە لایەن تۆوە کە یادمی پێ ئەکرێتەوە لە ناو کتێبی کەلیلەو دیمنەدا.

*** ***

دەرگای ناردنی برزەوی بۆ وولاتی "هیند" تەواوبوو

# دەرگـــای پیشاندانی کتێبەکە

ئەمە کتێبی کەلیلەو دیمنەیە کە زانایان لەسەر زمانی گیانەوەر دایان ناوە بە جوانترین شێوە ڕازاندیانەوە، کە تێگەیشتوان لەبەر زانین خوێندیانەوە بەڵام نەزان بۆ گاڵتەو ڕابواردن .

منالی قوتابی بەخێرایی وانە[1] لەبەر ئەکا بەبێ ئەوەی کە بزانێ چییەو باسی چی ئەکا. ئەوەندە ئەزانێ کە شتێکی بەنرخی دەست کەوتووە. وەك ئەو کەسەی کە گەیشتووە بەپلەی پیاوەتی ئەبینێ کە دایك و باوکی ماڵ ودارایییەکی تەواویان بۆ بەجێ هیشتووە ئیتر پێویستی بەیارمەتی دانی کەس نییە.

ئەوەی کە ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە پێویستە کە بزانێ چییەو لە بەر چی لەسەر زمانی گیانەوەر دانراوە. ئەگەر ئەوەی نەکرد ئامانجی لێ وەرناگرێ و تێی ناگات. هەر کەسێك کتێبی زۆربخوێنێتەوە تێیان نەگات هیچ کەڵکێك لە زانین وەر ناگرێ. وە ئەگەر کاری پێنەکا وەك ئەو پیاوەی بەسەردێت کە دەگێڕنەوە لەچەمێکدا گەنجینەیەکی زێڕی دۆزیەوە لەدڵی خۆیدا ووتی: ئەم پارەیە زۆرە ئەگەر بەتەنها جاری

---

[1] وانە = دەرس

کۆڵێکی لێ بەرمەوە ماندووم ئەکاو درێژە ئەکێشێ. لەپاشا چوو چەند کەسێکی بەکرێ گرت کەبۆی بگوێزنەوەماڵەوە. هەریەکەیان کۆڵێکی هەڵگرت و ڕۆیشتن. لەپاشان هەستاو چۆوەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام زێڕەکەی نەبینی، چونکە هەریەك لەوان کۆڵە زێڕەکەی بردبوو بۆخۆی ئەویش سزاو ماندوێتی نەبێ هیچی دەست نەکەوت، چونکە بیری دواڕۆژی کاروباری نەبوو. وە ئەوەی کە ئەم کتێبە بخوێنێتەوە و لێی تێنەگات وەك ئەوکەوسە وایە کەگوێزێکی ساغی ئەدەنێ. هەتا نەی شکێنێ سوودی لێ نابینێ. هەروەها وەك ئەوکەسە وایە کە ئەیەوێ بە وتاری کە سانی ترەوە ببێ بەزانا، ڕۆژێك داوا لەزانایەك ئەکا کە وتارێکی جوانی بۆ بنوسێ، ئەویش لەسەر لاپەڕەیەکی زەرد بۆی ئەنوسێ، کابرا لە ماڵەوە لەبەری ئەکا بەبێ ئەوەی بزانێ چییە. ڕۆژێ کە لە کۆبونەوەیەکدا ئەیخوێنێتەوەو هەڵەیەك ئەکا. زانایەك لەوێدا پێی ئەڵێ ئەوەت هەڵە کرد، من چۆن هەڵە ئەکەم ئەوەی کەمن بۆتانی ئەخوێنمەوە لەماڵەوەیە لەلاپەڕەکی زەردا نوسراوەو لەبەرم کردووە. ئەم قسەیە ئەوەندەی تر لە گەوجییەوە نزیکی کردەوە.

وە مرۆڤی ژیر ئەگەر زانین لەم کتێبەوە فێر بوو ئیشی پێ کرد سودی لێ وەر ئەگرێ، بەڵام ئەگەر ئیشی پێ نەکرد وەك ئەو پیاوەی بەسەردا دێ کە ئەگێڕنەوە دزێك چووە ماڵەکەی لەوکاتەدا نوستبوو. بەڵام بەئاگاهاتەوە، لەدڵی خۆیدا وتی: دەنگ ناکەم هەتا بەئارەزووی خۆی چی ئەکات بابیکات کەلێبووەوەپەلاماری ئەدەمێ و خۆشیی لێ تاڵ ئەکەم، کابرا خۆی کرد بەخەوتوو. دزەکە هەرچیەکی بەردەست ئەکەوت ئەی پێچایەوە. زۆری پێ چوو کابرا خەوی لێ کەوتبوو

کەخەبەری بووەوە دزەکە هیچی لەماڵەکەدا نەهێشتبوو دەرچووبوو.
زۆر پەشیمان بوو چونکە کەڵکی لەو زانینە وەرنەگرت کە لەبابەت
دزەکەوە ئەیزانی. زانین تەواو نابێ هەتا کاری پێنەکرێ. وەك دار
وایە بەرەکەشی کار پێ کردنە. زانا کار بە زانینەکەی ئەکا سودی لێ
وەربگرێ وەئەگەر ئەوەی نەکرد پێی ناوترێ زانا، ئەگەر یەکێك زانی
کە ڕێگایەك ترسناکە وە هەر لەوێوە ڕۆی پێی ئەوترێ نەزان. چونکە
خۆلێبایی بوون ئەوەی پێ ئەکاو توشی خراپە ئەبێ. وە ئەوەی کە
شوێنی بایی بوون بکەوێ ئەو شتانە بەدرۆ بخاتەوە کە زانراون و تاقی
کراوەن وەك ئەو نەخۆشە وایە کەواز لەو خۆراکانە دێنێ کەپزیشك بۆی
داناوە و زۆرخۆری هانی ئەدا بۆخواردنی هەموو جۆرە خۆراکێکی
باش‌وخراپ. وەئەوەی کە ڕێی چاکەو خراپە ئەزانێ و بەڵام ڕێی خراپە
ئەگرێ گوناهی بە ملی خۆیەتی. وە ئەگەر دوو کەس کوێرو چاوساغ
بەڕێیەکدا ڕۆیشتن و بەیەکەوە کەوتنە چاڵێکەوە. چاوساغەکە گوناه
بارترە، چونکە پێی ئەڵێن تۆچاوت هەیە، بەڵام ئەو کوێرە.

لەبەر ئەوە لەسەر زانا پێویستە کەڕەوشتی خۆی جوان بکا بە
زانینەکەی. وەئامانجی تەنها سودو قازانجی کەسانی تر نەبێ وەك
کانی کە هەموو کەس ئاوی لێ ئەخواتەوەو سودی بۆخۆی نییە،
هەروەها وەك کرمی ئاوریشم کە سود لەکارکردنی خۆی وەرناگرێ.
پیاو لە جیهاندا کەپێویستی بەزانین‌و ماڵ و چاکە کردن هەیە. زانا
نابێ باسی کەسێك بکات کەخۆیشی وەك ئەو وابێت. ئەوکاتە وەك
کوێرێکە کە گاڵتە بەکوێران ئەکات وەهەر کەسێك بیەوێ کارێك بکات
ئەبێ ئامانجێك و سنورێکی هەبێ وەبەخۆڕایی هەر درێژە بە ئیش نەدا.
زاناکان ووتویانە: ئەو کەسەی بەبێ ئامانج لەسەر کارێك بڕوا دوور

نییە کە ئامانجی ئەوکارە کە ئەو نایزانێ لە ناوی ببا. لەبەر ئەوە نابێ خۆی ماندوو بکا لە کارێکدا کە ئەنجام و سنوری نەبێ. ئەو کەسەی کە لە شتێکدا ئامانجی نەبێ کە لە دەستی چوو زویر نابێ. پێشینان وتویانە: دووشت هەیە کە لە هەموو کەسێکدا جوانن: خوا پەرستی و پەیدا کردنی ماڵ لە ڕێی ڕاستەوە ،، وە پیاوی ژیر جواننییە کە خەفەت بۆ شتێك بخوات کە لە دەستی دەرچووەو دەستەڵاتی بەسەریا نییە. دورنییە کە لەجیاتی ئەوە خوا گەلێ شتی باشتری پێ نەبەخشێ. بۆ ئەمەش سەر گوزشتەیەك هەیە کە ئەگێڕنەوە پیاوێکی هەژار شەوێك نوستبوو لە پڕ ڕاپەڕی و چاوی کەوت بەدزێك لە ماڵە کەیدا لە دڵی خۆی داووتی: ماڵەکە هیچی وای تیانیە ئیتر دەنگی نەکرد.

دزەکە دەستی کەوتە سەر کوپەیەك گەنم. ئەو شەوە هیچی دەست نەکەوتبوو لەبەر ئەوە کراسەکەی داکەندو گەنمەکەی تێکرد، کابرای خاوەن ماڵ لەدڵی خۆیدا ووتی: ئیتر لەبرسانا ئەمرم، پێشینان وتویانە ڕووتی و برسێتی لەهەر کەسێکدا کۆبوونەوە ئیتر لەناوی ئەبەن. لە پاشا هاواری کردو دزەکە ڕای کردو کراسەکەی بە جێما. کابرای هەژار بەیانی کردیە بەری و پۆشتە بۆوە. بەڵام پیاو نابێ چاوەڕوانی ئەو شتانە بێ، بەڵکو پێویستە هەوڵبدا بۆ ئەوەی کە ژیانی خۆش بێ چونکە ئەوانەی کە سەربەخۆ ڕۆژگار کاریان بۆ ڕێك ئەخات زۆر کەمن بەڵام ئەوانەی کە بەئیشکردن ژیانیان ئاسان ئەکەن زۆرن. وە ئەبێ پیاو کارێك بکا کەقازانجی هەبێ وەهەر بەخۆڕایی خۆی ماندوو نەکاو هیچی دەست نەکەوێ، وەك ئەو کۆترەی کەهەر بەچکە ئەکاو خاوەنەکەی لێی وەرئەگرێ وسەری ئەبڕێ. دوبارە هێلکە ئەکاو بەچکە

هەڵدێنی، خاوەنەکەشی دووبارە وەری ئەگرێ و سەریان ئەبڕێ. زاناکان ووتوویانە: خوا بۆ هەموو شتێك سنورێکی داناوە کە تیایدا ئەوەستێ وە ئەوەی کە ئیشی لەسنوور بردە دەرەوە دورنییە کە تووشی کەم و کوڕی نەبێ لەو کارەدا. هەروەها ووتوویانە: ئەوەی کە هەوڵی ژیانی ئێستاو دواڕۆژ بدات ژیان بۆ ئەوە. هەروەکو زاناکان ووتویانە کە سێ شت هەیە پیاوئەبێ خۆیانی بۆ ماندوو بکا: ژیانی خۆی، وە ڕابواردنی ناو خەڵکی، وە کردنی کارێك کەلەپاشا بەچاکە ناوی ببەن. وە ووتوویانە: چەند شتێك هەیە کە لە هەرکەسێکدا ببێ سەرناکەوێ، لەو شتانە: تەمەڵی، وە کات بە فیڕۆدان، وە باوەڕکردن بەقسەی هەموو کەس.

لەوانەیە ئەگەر یەکێك قسەیەکی درۆی بۆ بکا ئەویش بەوە خۆی تووشی خراپە بکا. وە لەسەر پیاوی ژیر پێویستە کە هەرگیز شوێن لە خۆبایی بوون نە کەوێ وەلە ستایش و هەڵکێشان دودڵ بێ وەگوێ لە هەموو کەس ڕا نەگرێ، وەئەگەر هەڵەی خۆی بۆ دەرکەوت پێویستە کە زوو بگەڕێتەوە، وە لە خۆیەوە کارێك نەکا هەتاڕاستی بۆ دەرنەکەوێ. وەك ئەو کەسە نەکا کە لە ڕێی ڕاست لائەداو هەر لەسەر چەوت ئەڕوا خۆی ماندو ئەکاو زیاتر لە ئامانج دور ئەکەوێتەوە، یان وەك ئەوەی کە چاوی دێشێ و ئەیخورێنێ کە لەوانەیە بەو خوراندنە کوێر ببێ. وە لەسەر پیاوی ژیر پێویستە کە باوەڕی بەکاری ڕۆژگار ببێ وە ئازا و نەبەردبێ چی بۆخۆی پێی خۆشە ئەوەشی بۆ هەمووکەس پێ خۆشبێ، وە هەرگیز لەبەر ئارەزووی خۆی کەس تووشی خراپە نەکا. ئەگەر ئەوانەی نەکرد بۆ ئەوەباشە کەئەو پەندەی بەسەردابێ کە بەسەر بازرگانێکدا هات بەهۆی هاوڕێکەیەوە:

ئەگێڕنەوە بازرگانێك لەگەڵ هاوڕێیەکیدا دووکانێك پڕ ئەکەن لەکوتاڵ و کەل و پەل. بازرگانەکەماڵیان لە نزیك دوکانەکەوە ئەبێ.
بڕیار ئەدا کە هەندێ کوتاڵی هاوڕێکەی بدزێ. فێڵێك ئەکات ئەچێ کرسەکەی ئەخاتە سەر ئەودەستە کوتاڵەو ئەڕوا هاوڕێکەی دێ کەکوتاڵەکان ڕێکبخات کراسەکە ئەبینێ لە دڵی خۆیدا ئەڵێ لە بیری چووە. هەڵی ئەگرێ و ئەیخاتە سەرکوتاڵەکانی خۆی، وەدەرگا دائەخاو ئەڕواتەوە. شەو بازرگانەکە لەگەڵ پیاوێکدا دێت، وەدەست ئەبا کوتاڵی ژێر کراسەکە ئەبا. بەنۆرە لەگەڵ کابرادا هەڵی ئەگرن و لە ماڵەوە بەشی ئەکەن. بەیانی سەیری کرد کەکوتاڵی خۆیەتی دزیویەتی زۆر پەشیمان ئەبێتەوە، لەپاشا بەرەو دوکان ئەڕواو سەیر ئەکا هاوڕێکەی لەوێیە خەفەت ئەخواو لەبەر خۆیەوە ئەڵێ ئەو منی بەجێ هێشتبوو بەسەر ماڵەکەیەوە هاوار بۆمن چۆن دڵ لەمن پیس ناکات. بەڵام من لە پێش ئەوەدا ئەو قسە بکا بۆی ئەبژێرم .
بازرگانەکە چووە ژوورەوە لەهاوڕێکەی پرسی ئەوە بۆچی وازویری؟ ووتی دەستە کوتاڵێکی تۆم وون کردووە منیش ئامادەم نرخەکەیت بدەمێ. بازرگانەکە ووتی: خەفەت مەخۆ چونکە ناپاکی و فێڵ کردن خراپترینی کارن. وە ئەوکەسە هەمیشە لەخۆی باییە، وەبزانە زۆردار هەر خراپەیەك بکات لە ئەنجامدا بەرۆکی خۆی ئەگرێتەوە.
وەمن فێڵم لێکردی. .لەپاشا بەسەرهاتی بۆگێڕایەوە. هاوڕێکەی ووتی: ئەمە وەك چیرۆکی بازرگان وایە. بازرگانەکە ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ هاوڕێکەی ووتی:

ئەگێڕنەوە بازرگانێك دوو کوپەی هەبوو یەکێکیان پڕبوو لە ئاڵتوون ئەوی کەش پڕبوو لەگەنم. دزێك بەوەی زانی ڕۆژێك بازرگانەکە لە ماڵ نەبوو چو بەدزییەوە کوپە گەنمەکەی برد وەبەسزایەکی قورس گەیاندیە ماڵەوە .کە کردیەوە پڕبوو لە گەنم. زۆر پەشیمان بووەوە و خەفەتی خوارد. کەلەقسەکەی بووەوە بازرگانەکە پێی ووت ئەم قسەیەی تۆ چەند دووره لەکارەساتەکەی من. وەمن پێ لەگوناه ئەنێم بەلام دەروونی خراپ هەر فەرمان بەخراپە ئەکا. هاوڕێیەکەی لێی خۆش بوو. بازرگانیش لەو ڕەوشتە لایدا کەبەنەزانی کردی. وە پێویستە لەسەر ئەوەی کە ئەم کتێبە ئەخوێنێتەوە هەر ئامانجی هەڵگێڕانەوەی پەڕەکانی نەبێ، بەڵکو بەووردی سەرنج لەمەبەست و سەرنجی ووشەکانی بدات وەکو برای بچوکی سێ براکە، کەباوکیان مرد بوونبەخاوەنی سامانێکی زۆر، هەردووبرا گەورە بەشی خۆیان بەخۆڕایی لەناو بردوو هیچیان نەما. کەبرای بچووك ئەوەی دی لەدڵی خۆیدا ووتی: ماڵ یەکێکی ئەوێ کۆی بکاتەوە لە ڕێی ڕاستەوە بۆ خۆیوکەسانی خۆی وەچاکەکردن لەگەڵ هاوڕێدا خەرجیبکات. ئەوەی کەماڵی زۆربوو بەلام لەڕێی ڕاستەوە خەرجی نەکرد پێویستی بەیارمەتی هەبوو بەهەژار دائەنرێ., بەلام ئەگەر لەڕێی ڕاستەوە خەرجی کر لەدوولاوە قازانج ئەکا: لەجیهاندا دانامێنێ، وە بەچاکەش ناوی ئەبەن. بەلام ئەگەر لە شتی بێ نرخ و هیچ و پووچدا دەستیکرد بەلەناو بردنی، کاتێك بەخۆی ئەزانێ کەهیچی بەدەستەوە نەماوە. ئەوکاتە پەژارەو خەفەت دایئەگرێ. منیش چاك وایە کە پارێزگاری لەم سامانە بکەم وەهیوام وایە کەقازانج بکەم و براکانم بەهۆی منەوە دەوڵەمەند ببنەوە. ئەم ماڵە هی باوکمە کەباوکی ئەوانیشە چاکتر وایە

کەبۆ خزم خەرج بکرێ هەرچەندە کەدووربن، نەخوازە کەئەوان برامن. لەپاشا سامانەکەی لە گەڵدا بەشکردن.

وە پێویستە لەسەر ئەوە کە ئەم پەڕاوە ئەخوێنێتەوە بەووردی خۆی پێوە خەریک بکات بەبێ ئەوەی کەزۆر لەخۆی بۆکا وەگەوهەری مەبەستەکانی تێ بگا، وە وانەزانێ کە ئامانجی ئەمە فێڵی دووبێ زمانە یان گفتوگۆی شێر و گایە، وە بەوە خۆی لە ئامانجی ڕاستی دوور بخاتەوە.

ئەو کاتە وەک ڕاوچییەکەی بەسەردادێ کە لەڕوبارێکدا ڕاوە ماسی ئەکرد، چاوی کەوت بەئێسقانی سەدەفێک لەڕوبارەکەدا بەگەوهەری تێگەیشت. لەو کاتەدا تۆڕەکەی ماسی یەکی گەورەی گرتبوو کەنانی ئەوڕۆژەی بۆ ئەو تیابوو. وازی لەوە هێناو چووە ڕووبارەکەوە بۆ سەدەفەکە کەدەریهێنا ئێسقانێکی بۆش بوو زۆرپەشیمان بووەوە. ڕۆژی دووەم لە لایەکی ترەوە تۆڕەکەی فرێدایە ئاوەکەوە و ماسییەکی گەورەی پێوە بوو. هەر لەوکاتەدا چاوی کەوت بەسەدەفێکی ڕاستەقینە، بەڵام ئاوڕی لێ نەدایەوە. لە دوای ئەو ڕاوکەرێکی تر هات و گەوهەرێکی بەنرخی تیا دەرهێنا. بەم جۆرە ئەوەی ئەگەر بیر لە ناوەڕۆکی مەبەستەکانی ئەم کتێبە نەکاتەوە، وەبەدەرەوەی قسەکانی خۆی خەریک بکا ت بەتایبەتی بەشی گاڵتە و گەپ وەک ئەوپیاوەی بەسەردادێ کە زەوییەکەی ئەکێڵێ لەپاش تۆوکردن ئاوی ئەدا، لەپاشا کاتی دوورینەوەی بەرەکەی دێ خۆی بەگوڵبڕین و لابردنی دڕک وداڵەوە خەریک ئەکات هەتا هەموو بەرەکەی ئەوەرێ. ئەوەی بەکار بێ

دەست گیری نابێ. وە ئەوەی کە ئەم کتێبە ئەخوێنێتەوە ئەبێ بزانێ کە لەسەر چوار ئامانج دانراوە:

(یەکەم): دانانی لەسەر زمانی گیانەوەرانی بێ زمان بۆ ڕاکێشانی سەرنجی کەسانی گاڵتەچی و گەنجان، وەشادکردنیان بە قسەی گیانەوەر.

(دووەم): دەرخستنی بیری چوارپێ بە چەند جۆرێك کە پادشایان شاد بکا، وە هانیان بدا لەسەر خوێندنەوەی.

(سێ یەم): بۆ ئەوەی هەموو کەسێکی تر وەری بگرێ و بڵاو بێتەوە ڕۆژانی ساڵ وایان لێ نەکا کە لێیان وەڕەس بن ئەمەش سوودی وێنە گران و نووسەران و وەر گێڕانی تییێدایە.

(چوارەم): کە دوا ئامانجە پەیوەندی تایبەتی تەنها بە فەیلەسوفەکە خۆیەوە هەیە.

********

**دەرگای پیشان دانی کتێبەکە**

**تەواو بوو...**

# دەرگـــــای برزەوی پزیشك

## بە نووسینی (بوزور جەمهیر)ی کوڕی بەختەکان

(برزەوی) کە سەرەك پزیشکانی ئێران بووە ئەم کتێبەی نوسیوەو گۆڕیویەتیە سەر زمانی فارسی، وەك لە پێشەوە بە درێژی باسمان کرد.

(برزەوی) ووتی: باوکم یەکێك بووە لە فەرماندەرانی شەڕ وە دایکم لە ماڵەوە گەورەی ((زمازیمە[1]))بوو لە ئێران. وە من بەخۆشەویستی و ڕێز پەروەردەیان ئەکردم. تەمەنم گەیشتە حەوت ساڵ ناردمیانە لای مامۆستا لەپاش فێربوونی نوسین و خوێندنەوە، ئەوەی کەئارەزووم ئەکرد پزیشکی[2]بوو. کە بووم بەپزیشك بیرم لەوە ئەکردەوە لەو چوار شتە کە مرۆڤ هەوڵیان بۆ ئەدەن بۆکامیان هەوڵبدەم بە هۆی ئەم زانینەوە بۆماڵ هەوڵ بدەم یان بۆناوی بەرز یان بۆ ڕابواردن یان بۆدووا ڕۆژی زیندووبوونەوە؟ خۆشم چاوم بەوە کەوتبوو کە ئەگەر پزیشك بەڕاستی کار بکاو کۆڵنەدا پاداشتی ئەو بەهەشت نەبێ هیچی تر تەواوی ناکا. لەبەر ئەوە وام بەباش زانی کە پزیشکی بەرنەدەم بە هیوای بەهەشت. نەوەك وەك ئەو بازرگانەم بەسەر

---

[1] زمازیمە = کۆمەڵێکن لەئێران

[2] پزیشکی = دوکتۆری

دابیٚ کە گەوهەرە بەنرخەکەی دابەمووروویەك کە بەکاری هیچ نەهات.
وە زانیم کە پزیشکی ڕاست جگە لە بەهەشت لە جیهانیشدا هەر پاداشی هەیە وەك جوتیارێك کە زەوییەکەی ئاوەدان ئەکا بە هیوای کشتوکاڵ، لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك جۆرە گژوگیایەکی تری لیٚ ئەڕویٚ.

لەبەر ئەوە دەستمکرد بەدەرمانکردنی نەخۆش. وە دەستم بە کەسەوە نەئەنا. وە بەچاکترین دەرمان خەریکی نەخۆشێك ئەبووم بەبیٚ ئەوەی چاوەڕوانی پاداشتبم وە هیوام هەر دوا ڕۆژ بوو.

هاوڕێکانم کە هەرچەند لە من زیاتریش نەبوون بەڵام هەموو دەوڵەمەندو خاوەن کۆشك و تەلار بوون. کاتێك کە ئەوانم بەوجۆرە دی منیش ئارەزووم بۆئەو جێگەو ڕابواردنەی ئەوان هاتە کوڵ، بەڵام زوو فریای خۆم کەوتم سەرزەنشتی خۆمم کرد و لە دڵی خۆمدا ووتم بۆچی داوای شتێك ئەکەی کەخاوەنەکەی هەمیشە لەماندوویەتیدایەو ناحەسێتەوە.

وە کە لەدەستی چوو تووشی سزاو ناخۆشی ئەبیٚ. بۆچی نازانی کەلەپاش ئەم جیهانە هەرچی مایەی خۆشی هەیە لە بیرت نامێنی. بۆچی وازناهێنی لە هاوڕێیەتی کەسانی بەدخوو لەبەر ئەم جیهانە کە لەناو ئەچیٚ. وە ئەوەی کە خاوەنی هەر شتێك بیٚ بۆ ئەو نابیٚ. وە کەس ئەم جیهانەی ناویٚ گەوج و نەزاننەبیٚ. کاری چاکە بکە وە بزانە کە ئەم لاشەیەی تۆ بۆ مردن درووست بووە کە تێکەڵە لە ئەندامی پاك و پیس کە ژیان بەووردی ئەیان گێڕیٚ. وە ژیانیش دوایی دیٚ. ئەم لاشەیە وەك بتێك وایە کە هەموو ئەندامەکانی بەیەك بزمار ڕاوەستاون کە بزمارەکەیان دەرهێنا هەمووی ئەکەویٚ و پارچە پارچە ئەبیٚ.

هەرگیز هاورێی خۆشەویست لە خۆتت بایی نەکا، چونکە ئەنجام هەر جیابوونەوەیە. وەك کاسەی دار کە بۆ خۆراك و خواردنەوە بەکار دێ کە شکا ئەیکەن بە سووتەمەنی. هەرگیز خزم فێری کارێکت نەکەن کە تووشی سزا ببی بۆبەهێزکردنی خزمایەتی و سوودی ئەوان. وەك داری عوود کە ئەیسووتێنن بۆنی هەڵ ئەمژن. هەرگیز کاری پاشەڕۆژت بەلاوە گران نەبێ لە بەر کاری گێتی، وەشتێکی زۆر بەکەم نەفرۆشی. وەك ئەو بازرگانەی کە پڕ ژوورێك سەندەڵی[1] هەبوو لەبەر تەمەڵی بەکێشان نەی فرۆشت بەگۆترەدای بەنرخێکی کەم.

بیرو باوەڕی ئادەمیزاد جیاوازە، هەر یەکە وەهەر کۆمەڵە ئارەزووی شتێك ئەکات، وەهەریەکە بەپێچەوانەی ئەوی تر کارئەکاو دوژمنی ئەوە. منیش کە ئەوەمزانی شوێنی کەس نەکەوتم نەوەك ئامانج و بیرو باوەڕی یەکێك لەوانە نەزانم، ئەوکاتە وەك دزە هەڵخەڵەتاوەکەم لێ دێ کە ئەگێڕنەوە: ئەچێتە سەر ماڵی دەوڵەمەندێك. کابرا خەبەری ئەبێتەوە بەژنەکەی ئەڵێ تۆ لێم بپرسە بڵێ: ئەم ماڵە زۆرەت چۆن دەست کەوتووە؟! ئەویش بەدەنگێکی بەرز لێی ئەپرسێ: ئەرێ پیاوەکە تۆ ئەم ماڵە زۆرەت چۆن کۆکردۆتەوە؟ کابرا ووتی: بەدزی کۆم کردووەتەوە، من لەدزیدا زانینێك دەزانم کە زۆرئاسانەو کەسیش بە هۆی ئەوەوە پێم نازانێ: جاران شەوانی مانگە شەو ئەچوینە سەربانی ماڵی دەوڵەمەندانی وەك خۆمان. من ئەچوومە سەر کلاوڕۆژنەی خانووەکەو حەوتجار ئەمووت (شەو لەم شەو لەم) لەپاشا دەستم بەشەوقی مانگەوە ئەگرت و ئەچوومە خوارەوە بەئارەزووی خۆم

---

[1] سەندەڵ = دارێکیبۆن خۆشە

خشڵ وکەل و پەلم بار ئەکرد کەس پێی نەئەزانیم دوبارە حەوتجاری تر ئەم خوێندەوە و دەستم ئەگرت بەشەوقی مانگو سەرئەکەوتمە سەربانەکە. وەخۆم و هاوڕێکانم بەبێ ترس ئەڕۆیشتین.

دزەکە لە سەربانەکە لەگەڵ هاوڕێکانیدا گوێیان لەو گفت و گۆیە بوو وتیان گەیشتین بەئامانجی خۆمان. ئەمشەو تالانی ئەکەین. ڕاوەستان هەتا نیوە شەو. پاشان چوونە سەر کلاوڕۆژنەکەو حەوتجار وتی (شەو لەم شەو لەم) وە دەستی برد بۆ شەوقی مانگەکە بچێتە خوارەوە، بەڵام بەتەوقی سەردا کەوتە خوارێ و گلۆلە بوو.

کابرای خاوەن ماڵ پەلاماری دایە. بەدارێکەوە بەسەر سەریەوە وەستاو وتی: تۆ کێیت؟ وتی من خۆشباوەڕی هەڵخەڵەتاوم بەشتێك کەهەرگیز ناکرێ، ئەویش بەری پارانەوە جوانەکەی تۆیە. ئیتر منیش لەو هاوڕێیە دوورکەوتمەوە نەوەك بمخاتە ناو گیرو گرفتێکەوە وەگەڕامەوە بۆسەر کاروبای ئاینەکان کە خۆمیان پێ ڕاست بکەمەوە بەڵام کەسێك نەبوو کە بەڕاستی بتوانێ وەڵامم بداتەووە وە قسەکانیان جێگای باوەڕ نەبوو. لە بەرئەوە ووتم چاکتر وایە کە ئاینی باوك و باپیرم بگرمو لەسەری بڕۆم، بەڵام کەسەیرمکرد ئەویش لق و پۆپی زۆری لێ ئەبێتەوە، ئیتر ئەبێ یەك لەدوای یەك بەشوێن هەموو ئاینەکاندا بگەڕێم و لێیان بکۆڵمەوە. لەو کاتەدا ترسی مردن هات بە بیرما کە لەپڕ بمرم و بەهیچ ئامانجێك نەگەم، وە ئەم جیهانە بەجێ بهێڵم هەروەك و خۆی دوایی دێ و چی تیایە لەناو ئەچێ. ئیتر ویستم کە خۆم تووشی سزاو دەردی سەری نەکەم. وەڕێیەك بگرم کە لەگەڵ هەموو ئاینەکاندا بگونجێ. دەستم لەکوشتن و بڕین هەڵگرت، وەخۆمم لە خراپەو درۆو دزی و ناپاکی دورخستەوە، وە پەیمانم کرد کە زۆر لە

کەس نەکەم، وە زیندوو بوونەوەی دوایی بەدرۆ نە خەمەوە، وە گاڵتە بەچاکەو خراپەی نەکەم. وە بەدڵ ڕقم لەپیاو خراپ ئەبۆوە. وە بووم بە هاوڕێی پیاو چاکان و زانیم کە چاکە هیچ شتێکی ناگاتێ، پیاو تووشی کامەرانی ئەکا. وەچاکە ئەوەندە گەورەیە کە هەر چەندە دابەش بکرێ تەواو نابێ، بەڵکو زۆرتر ئەبێ، وە هەر گیز ترسی لێ ناکرێ: نەپادشا داگیری ئەکا، نەدز ئەیبا نەئاو نوقمی ئەکا، نە ئاگر ئەیسوتێنێ وەنەدڕندەو نەباڵندە ناتوانن کە زیانی پێ بگەیەنن .سەیرم کرد کە پیاوی گەوجی نەزان ڕۆژێك دەستی ئەکەوێ و ڕۆژی دوایی لە کیسی خۆی ئەدا، کەئەگەر ئارامی لەسەری بگرتایە زۆر گەنجی بەنرخی دەستگیر ئەبوو. بەڵام ئەوەی بەسەر خۆیدا هێنا کەبەسەر بازرگانێکدا دا هات کە:

ئەگێڕنەوە گەوهەرێکی بەنرخی هەبوو، وەستایەکی شارەزای بەکرێ گرت کەبۆی کون بکات بە سەد دینار.

چوو بۆماڵی وەستاکەو سەیری کرد لە قوژبنێکی ژورەکەیدا دەفێك کەوتووە. بازرگانەکە ووتی: دەف لێدانیش ئەزانی؟ ووتی: بەڵێ. کابرا لەلێدانیدا زۆرشارەزا بوو. بازرگانەکە ووتی: ئادەی دەفمان بۆلێ بدە ئەویش لەخۆشیاندا سەری ئەلەقاندو چەپڵەی بۆلێ ئەدا، هەتا ڕۆژ ئاوا بوو. وەستاکە دەفەکەی فڕێداو ووتی: بێنە سەد دینارەکە بازرگانەکە ووتی: خۆتۆ تەنها دەفت لێداوە. ووتی من بەکرێ گیراوی تۆم هەرچیت بووتایە ئەمکرد وازی لێ نە ئەهێنا هەتا سەد دینارەکەی لێ سەند وەگەوهەرەکەش هەر بەکوننەکراوی مایەوە.

منیش ئیتر خۆمم لە خۆشەویستی جیهان دوور خستەوە، وەزانیم کە خوا پەرستی ڕێی دوا ڕۆژ ئاسان ئەکات هەروەك باوك کە ڕێگا بۆ کوڕ ئاسان ئەکات. وە هەر ئەوە کەدەرگایەکی کراوەی بەهەشتە. چونکە خواپەرست بێ هەوایە، وە وازی لە جیهان هێناوە، وە چاوی لە ماڵی کەس نییە، لە بەر ئەوە ڕزگارەو هەموو کەس خۆشی ئەوێ. منیش خەریك بوو ببمبەخوا پەرست، بەڵام لەوە ترسام لەسەر ژیانی ئەوان خۆم ڕانەگرم. وە واز لەکاروباری خۆشم بێنم وەئەوەیشم بۆنەکرێ ئەوکاتە وەك ئەو سەگەم بەسەردادێ کە ئەگێڕنەوە بەسەر ڕوبارێك دا تێپەڕی و وە ئێسقانێکی بەدەمەوە بوو، لە ئاوەکەدا وێنەی خۆی دی بە ئیسقانێکی تری تێگەیشت پەلاماری دایەو ئێسقانەکەی خۆشی لە کیس چوو وەهیچیشی دەست نەکەوت ئیتر منیش بڕیارمدا هەر لەسەر ئەو ڕەوشتە کۆنەی خۆم بمێنمەوە.

لەپاشا بیرم کردەوە زانیم کە هیچ خۆشیەك نیە کە نەگۆڕێ بۆ ناخۆشی وەزانیم کە جیهان وەك ئاوی سوێر وایە کە تینو هەتا لێی بخواتەوە زیاتر تینووی ئەبێ. هەروەها وەك ئێسقانێك وایە کەسەگ هەڵی ئەگرێ و بۆنی گۆشتی لێدێ ئەوەندەی ئەکرێنێتەوە هەتادەمی بریندار ئەبێ، هەروەها وەك کوڵارەیەك وایە کە پارچەیەك گۆشتی بەدەمەوەیەو باڵندەی زۆری لێ کۆ ئەبێتەوە. ئەویش ئەوەندە ئەگەڕێ هەتا ماندوو ئەبێ وەلەدەمی ئەکەوێتە خوارەوە، هەروەها وەك گۆزە هەنگوینێك وایە کەژێری هەنگوینەکە زەهرە، کە لێی ئەخۆن شیرینە، وە کە تەواو ئەبێ مردنێکی خێرایە.

هەروەها جیهان وەك خەوی نووستوو وایە هەتا نوستوو شتی سەیر ئەبینێ وەلەخۆشیدایە، وە کە خەبەری بووەوە ئەوخۆشی یەی ئەڕوا.

کە بیرم کردەوە ویستم بگەڕێمەوە ببم بەخودا پەرست، بەڵام دوبارە ترسام کە بۆم نەکرێ و پەشیمان ببمەوە. وەك ئەو داد پرسەی [1] کە گوێی لە دوژمنی یەکەم گرت و بڕیاری بۆدەرکرد. بەڵام کە دوژمنی دووەم هات لەو بڕیارە لایداو پەشیمان بووەوە. لەپاشا لەوە بیرم ئەکردەوە کەتاڵ و ناخۆشە ژیانی خودا پەرست، ووتم: ئەم ئێش و ئازارە چەند کەمە بەرامبەر بە خۆشی بەهەشت کە کۆتایی نایە. وە سەیری ژیانی جیهانیشم کرد ووتم:ئەم ژیانە چەند تاڵە پیاو ئەخاتە سزایەك کەتەواو نابێ وە ووتم: ئەگەر پیاو پێی بڵێن کەسەدساڵ بژی، وە هەموو ڕۆژێك پارچەیەکی ببڕن وەبۆ ڕۆژی دوایی چاکی بکەنەوە بەمەرجێك کە سەدساڵەکە تەواوبوو بکەوێتە خۆشییەکی تەواوەوە وە لەهەموو ئازارێك ڕزگاری ببێ، بە ڕاستی ئەبێ ئەو سەدساڵەی بەلاوە هیچ نەبێ ئیتر پیاو چۆن نابێ ئارام بگرێ لەسەر ژیانی خوداپەرستی کە ئێش و ئازاری ئەو چەندڕۆژە ژیانێکی خۆشی لە دوایە کە دوایی نایەن .

ئیتر با بزانین کە جیهان هەمووی دەردو سزایە. ئایا ئەوە ئادمیزاد نییە کە بەدەست سزاوە ئەتلێتەوە لەوکاتەوە کە لە سکی دایکیدایە هەتا ئەمرێ؟ کاتێ منالی ساوا چەند جۆرە سزا ئەچێژێ لەکاتی برسێتیو تینوێتیدا ناتوانێ داوای خۆراك و خواردنەوە بکات، کە نەخۆش کەوت ناتوانێ هاواری نەخۆشییەکەی بکات، جگە لەو ئازارەی کە تووشی ئەبێ لە کاتی هەڵ گرتن و دانان و ڕاکێشان و پێچانەوەو شتن و سڕین و چەور کردندا. وە کە لەسەر پشت جوڵاندیان ناتوانێ

[1] داد پرس = حاکم

بەهیچ لایەکی تردا بجولێتەوە. وە هەتا مەمکە خۆرەیە جۆرەها سزای تووش ئەبێ، کە لەوەش ڕزگاری بوو گەلێ سزای تریشی لە دڵ ڕەقی مامۆستاو ناخۆشی وانە وەڕس بوون لە نووسین تووش ئەبێ. وە چەند سزای تر لە نەخۆشی و دەرمان پارێزی و خواردن و خواردنەوە. وە کە گەورە بوو کۆکردنەوەی ماڵ و پەروەردەکردنی ماڵ و ترس و ماندووبوونی ئیش و کار.

جگە لەم شتانە لەگەڵ دوژمنانی ناولەشی خۆیدا ئەتلێتەوە کە ئاوی ڕەش و زەردباوو بەڵغەم وخوێنن. جگە لە بونی ماری زەهراوی ترسی دڕندەو مێش و مەگەز.

لە گەڵ دور خستنەوەی گەرما و سەرماو باو باراندا، لەپاشان چەند جۆرە سزای پیری بۆ ئەوانەی کەئەیگەنێ.

ئەگەر بیری لەو شتانە نەکردەوە و نە ترسا پێویستە کەپەند لەو کاتە وەربگرێ کە ئەمرێ وجیهان بەجێ ئەهێڵێ. لەو کاتەدا یادی ئەو بەسەرهاتە گەورەیە ئەکاتەوە لە بەجێهێشتنی خزم و کەس و کارو هاوڕێ. وەهەرچی هەیە لەجیهاندا وازی لێ دێنێ و چاوەڕوانی ئازاری گەورەی پاش مردن ئەکات. ئەگەر ئەوەی نەکرد بەڕاستی نەزان و تێنەگەیشتووە. ئەوە کێیە لەجیهاندا دەسەڵاتیی هەیەو ڕانا بوێرێ وە خۆی لێ بایی نەبووە؟ بە تایبەتی لەم کاتەدا کە وەك ئاوی ڕوون دیارە، بەڵام لەڕاستیدا لێڵە، هەرچەندە کە پادشاش گەورەو بەدەستەڵاتبێ، وە داد پەروەرو زانا بێ، ئێمە ئەبینین کە ئێستا لەم دەمەدا ئیشی ڕاست نەماوە. چاکەو پیاوەتی کەمبۆتەوە، درۆو دەلەسە زۆربووە. هەروەکو کاربەدەستان سەریان لێ تێکچووبێ ماف هەژار ئەدەن بەدەست زۆردارانەوە .. خۆ دەست هەڵگرتن نەماوە پیاو خراپ بەرەو ئاسمان

سەر ئەکەوێ، پیاوی چاکیش بۆ ناوسکی زەوی. پادشاش لایەنی تاوانبار ئەگرێ. جیهان وەك مارێکی لێهاتووە کە لەسەرکلك سەما ئەکاو ئەڵێ: ڕۆژی چاکە نەما، کاتی خراپەو ناپاکییە.

ئادەمیزادیش لە جیهاندا کە بەرزترینی زیندەوەرە بەدەست نەگبەتی و خراپەوە ئەتلێتەوە. منیش ووتم ئەمە جواننییە کە پیاو ئەو شتانە بزانێ و نەتوانێ کەخۆی ڕزگار بکا لەبەر خۆشییەکی کەم لە خواردن و خواردنەوە. وە بینین و.بیستن و بۆنکردن و دەست لێدان، ئەمان کە نایەڵن پیاو ڕزگاری ببێ زۆرسەرم سوڕما.

لەبەر ئەوە پەندێکم بۆئادەمیزاد ووت کەئەویش ئەوەیە کە ئادەمیزاد وەك پیاوێك وایە کە لەترسی فیلێکی گەورە ڕزگاری بوو. بەڵام کەوتە ناوبیرێك ئەیویست خۆی ڕزگاربکا. دەستیگرت بەدوو چڵەوە کەلەسەر کەناری بیرەکە ڕووا بوون. کە لەپڕ قاچی کەوتە سەرشتێك لەسەر چمکی بیرەکە سەیری کرد ئەوا چوارمار لەکونەکانیانەوە سەریان دەرهێناوە. وەسەیری بنی بیرەکەی کرد ئەژدەهایەکی گەورەی دی کەدەمی کردبۆوە و چاوەڕوانی ئەکا. سەری بەرز کردەوە بۆ دووچڵەکە چاوی کەوت بە دوومشکی ڕەش و سپی کە لە ژێرەوە خەریکی قرتاندنی چڵەکانن کە ئەو دەستی پێیانەوە گرتبوو.

کابرا ویستی فێڵێك بدۆزێتەوە و خۆی ڕزگار بکات. لەو کاتەدا لە نزیکی خۆیەوە گۆزەیەکی دی کە هەندێ هەنگوینی تیا بوو،دەستیکرد بە خواردنی. ئەو هەنگوینە وای لێکرد کە گوێ نەداتە دۆزینەوەی چارەیەك و خۆی ڕزگار بکا. بیری لەوە نەکردەوە کە قاچی لەسەر چوار ماری زەهراوییە. وە بیری لەوە نەکردەوە کە مشکەکان خەریکن چڵەکان

لەڕەگ دەر دێنن و ئەویش ئەکەوێتە دەمی مارە زلەکەوە. بەم جۆرە ئاگای لە خۆی نییەو خەریکی هەنگوین خواردنە. ئەوەندە ئەزانێ ئەکەوێتەناو دەمی ئەژدەهاکەوە. ئەویش قووتی ئەدا.

منیش ئەو بیرەم داناوە بەجیهان کەپڕە لە خراپەو ترس و سزا. وە چوار مارەکەشم داناوە بەو چوارشتە تێکەڵەی کەلەناو لەشدان، کە هەرکاتێ شڵەژان و هەستان وەك زەهری ماریان لێدێ. دوو چڵە کەشم داناوە بە هاتنی مردن و لەناو چوونی ژیان کە ئەبێ هەربێ دوو مشکە ڕەش و سپی یەکەشم دانا بە شەوو ڕۆژ کەبەبێ ڕاوەستان خەریکی تەواو کردنی ژیانن. وەئەژدەهاکەشم دانا بەمردن. وە هەنگوینەکەشم دانا بە تۆزە خۆشیەکەی کە ئادەمیزاد تووشی ئەبێ لە خواردن و خواردنەوەو بیستن و بۆنکردن و دەستلێدان کە لە ڕێگای ئامانج لای ئەدەن و ئاگای لە خۆی نییە .

ئیتر منیش دەستم هەڵگرت و بەئیشی خۆم ڕازی بووم وەئەوەی لە توانامدا بوو کردم بە هیوای ئەوە کە لە ماوەی ڕۆژانی داهاتوودا کاتێك بێتە پێشەوە و تووشی پیاو چاکێك ببم کە بمخاتە سەر ڕێی ڕاست، وە هێزێکی تازە پەیدا بکەمەوە. بەم جۆرە هەستام، وە گەلێ کتێبم نووسییەوە. وەکە لە وولاتی هیند دەرچووم ئەم کتێبەم بەنوسراوەیی لەگەڵ خۆمدا هێنا بۆئێران.

*** ***

دەرگای برزەوەی پزیشك

--- تەواو بوو---

# دەرگـــای شێروگا

## کە دەست پێکردنی کتێبەکەیە



(دەبشەلیم) پادشای هیند ووتی بە (بەیدەبا)ی فەیلەسوف پەندێکم بۆبڵێ لە بابەت دووهاوڕێی خۆشەویستەوە کە درۆزنی فێڵباز لە یەکیان ئەکا.

(بەیدەبا) ووتی: ئەی پادشا ئەگەر دووکەسی خۆشەویست بوون بە هاوڕێی دڕۆزنێکی فێڵباز زۆری پێ ناچێ لە یەك ئەبن. بۆ ئەمەش سەر گوزشتەیەك هەیە. پادشا ووتی:

ئەوە چۆن بووە؟ بەیدەبا ووتی:

ئەگێڕنەوە لە خاکی (دەستاوەند) پیاوێکی پیر بو وەسێ کوڕی هەبووە کە گەورە بوون دەستیان کرد بە لەناو بردنی ماڵی باوکیان وە کاریشیان نەئەکرد کابرا پێ ووتن: کوڕم پیاو لە جیهاندا ئیشی بەسێ شت هەیە کە بەچوار شت دەست ئەکەون. ئەو سێ شتە کە ئەیەوێ ئەمانەن: ماڵ، پایە، پاشە ڕۆژ. ئەو چوار شتە کە ئەمانە پەیدا ئەکەن.

یەکەم: پەیدا کردنی ماڵ لە ڕێیەکی ڕاستەوە .

دووەم: کارکردن بەو سامانەوە کە پەیدای ئەکا .

سێیەم: خواردنی بەرەکەی بە جۆرێکی ڕاست .

چوارەم: پیاوەتی کردن بەو پارەیەی لەگەڵ خزم و کەس وهاوڕێ بە جۆرێك کە لە پاشەڕۆژدا سوودی لێوەربگرێ، جگە لە ئاسانکردنی ژیان لە جیهاندا.

هەر کەسێك ئەوەی نەکرد ئامانجی دەست ناکەوێ. چونکە ئەگەر کاری نەکرد ماڵی نابێ. وە ئەگەر ماڵی زۆر بوو،بەڵام نەیزانی چۆنی خەرجی ئەکا دوور نییە لەکیسی بچێ و بە هەژاری بمێنێتەوە وەئەگەر کاری پێوە نەکرد هەر لە دەستی ئەڕوا وەکو "کل" کە تەنها تۆزی کلچێوکی لێ وەر ئەگیرێ کەچی ئە بینین زوو تەواو ئەبێ و نامێنی، خۆ ئەگەر شاردیەوەو سوودی لێوەرنەگرت وەك هەژارێك وایە کە هیچ شك نابا. ئەمەش پارێزگاری ماڵەکەی ناکا بەهۆی ئەو کارەسات و گیرو

گرفت و نەخۆشییەوە کە ڕۆژگار بەسەریا دێنێ وەکوئەستێڵی ئاو کە ئەگەر هەمیشە ئاوی برژێتە ناو وەکونجێکی نەبێ کە بچێتەدەرەوە خراپ ئەبێ وەکونی تێ ئەبێ، وە دوور نیە کە بە جارێك ئەو ئەستێڵە گەورەیە بتەقێ و هەموو ئاوەکەی بە خۆڕایی بڕوا لەپاشا کوڕانی کابرا ئامۆژگاری باوکیان وەرگرت.

کوڕە گەورەکەیان بەبازرگانی ڕوویکردە خاکێك کەپێیان ئەووت: (مەیوون) سواری تەختە ڕوانێك بوو کە دووگا ڕایان ئەکێشا کە یەکێکیان ناوی (شەترەبە ) بوو ئەوی تریشیان (بەندەبە) کابرا ڕێی کەوتە شوێنێکی قوڕو چڵپاو. (شەترەبە)چەقی، هەر چەندیانکرد دەر نەهات پیاوێکیان بەلاوە بەجێ هێشت کەقووڕەکە ووشك بووەوە دەری بێنێ.

کابرا ئەو شەوە بەدیار گاکەوە بوو، بەڵام ترسی لەو شوێنە پەیدا کرد، هەستاو گاکەی بەجێ هێشت و هاتەوە بۆلای خاوەنەکەی و پێی ووت: گاکە مردار بووەوە، لەپاشان ووتی: برام پیاو کە ڕۆژی تەواوبوو هەرچەندە خۆی بپارێزێ زیاتر لەمردن نزیکی ئەکاتەوە، وەك ئەوەی کە ئەگێڕنەوە پیاوێك بە چۆڵاییەکدا تێئەپەڕێ و تووشی گورگێکی هار ئەبێ، کابرا ڕائەکات وەلە دوورەوە دێیەك بەدی ئەکا لە پشت ڕووبارێکی گەورەوە. کەهاتە سەر ڕووبارەکە هیچ پردی نەدی، گورگەکەش بەدوایەوە بوو، لە ترسی گیانی خۆیدا بەدەم ئاوەکەوە مەلەشی نەئەزانی. خەریك بوو بخنکێ. بەڵام چەند کەسێك لە دانیشتوانی دێیەکە دەریانهێنا، کە هۆشی بە خۆیدا هاتەوە چاوی کەوت بەتەنهاخانوویەك لە قەراخی دۆڵێکدا، چوو کەلەوێ بحەسێتەوە.

سەیری کرد کۆمەڵێك جەردە ڕێیان لە بازرگانێك بڕیوە خەریکن پارەکەی بەش ئەکەن و ئەشی کوژن. کابرا لەترسا ڕایکردوو هاتەوە بۆدیٚ یەکە لەویٚ پاڵیدا بەدیواری خانوویەکەوە کە بحەسێتەوە کەچی دیوارەکەی بەسەردا ڕووخاو مرد .

بازرگانەکە ووتی: ڕاست ئەکەی منیش ئەوەم بیستووە، بەڵام گاکە لە قوڕەکە هاتە دەرەوە بەلەوەڕ لەودەشتانەدا ئەگەڕاو ئاوی ئەخواردەوە. هەتا بە تەواوی قەڵەوبوو کەئەیبۆڕان ئەوناوە دەنگی ئەدایەوە.

لە نزیك ئەوشوێنەوە دارستانێك هەبوو کە شێرێکی زۆربەهێزی تیادابوو پادشای ئەو ناوچەیەبوو گەلیٚ دڕندەی لەگەڵدابوو لەگورگ و چەقەڵ و ڕێوی و وێزو پڵنگ. ئەوشێرە زۆر لە خۆبایی بوو، وەبەقسەی کەسی نەئەکرد، گوێی لەدەنگی گاکەبوو هەرگیز گای نەدیبوو، چونکە لە جێی خۆی نەئەجولاٚ هەموورۆژێك سەربازەکانی خواردنیان بۆ ئەهینا. لەناو ئەو دڕندانەدا دووچەقەڵ هەبوون کەناویان (کەلیلەو دیمنە) بوو، خاوەنی زانین و هونەر بوون. (دیمنە) بە (کەلیلە) ی برای ووت: بۆچی ئەم شێرە لە جێی خۆی ناجولیٚ؟! (کەلیلە) ووتی کارت بەو قسەیە چی یە؟ ئێمە لە دەرگای پادشادایین هەرچی ئەو پێی خۆشە وا ئەکەین، وە هەرچی ئەو حەزی لێناکا لێی دوور ئەکەوینەوە، ئێمە لەو پایە بەرزانە نین کە قسە لە کاروباری پادشا ئەکەن. واز بێنە. وە بزانە ئەوەی کە خۆی لە کارووباری کەسانی ترا هەڵبقورتێنیٚ ئەوەی بەسەردا دێت کە بەسەر مەیمونەکەدا هات. بە دەست دارتاشەکەوە. (دیمنە) ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ (کەلیلە) ووتی: ئەگێڕنەوە مەیمونێك

چاوی بە دارتاشێك کەوت کەتەختەیەکی لەنێوانی دومێخدا ئەقڵیشاند کە خۆی سواری تەختەکە ببوو مەیموونەکە سەری سوڕما، لەپاشا دار تاشەکە چووە دەرەوە. مەیمونەکە سواری تەختەکەبوو پشتی کردە مێخەکەو ڕوویشی کردەتەختەکە، کلکی کەوتە ناوقڵیشی تەختەکەوە، کە مێخەکەی دەرهێنا قڵیشەکە کلکی گرت وەلەبەر ئازاری کلکی ئاگای لە خۆی نەما کەدارتاشەکە هاتەوە ئەمەی دی دەستی کرد بە لێدانی مەیمونەکە. ئەو لێدانەی کە لە دارتاشەکەخواردی ئازاری زیاتر بوو لە قڵیشی تەختەکە.

دیمنە ووتی: ئەم قسەیەم بیست، بەڵام ئەوەی کە لەپادشا نزیك ئەبێتەوە لەبەر سکی نییە، بەڵکو لەبەر پیاوەتییە کەئەیەوێ دۆست شادو دوژمن بێ دەنگ بکات.

پیاوی واهەیە کە پیاوەتی لێ نایە، ئەو جۆرە کەسانەن کەبەشتی کەم و هیچ و پوچ ڕازی ئەبن، وەك ئەوسەگەی کە بە ئێسقانە ووشکێك ڕازییە. بەڵام پیاوی بەرز هەرگیز بەشتی هیچ و پووچ ڕازی نابێ هەتا ئەگاتە پایەی خۆی، وەك ئەو شێرەی کە کەروێشك ئەگرێ بەڵام کە چاوی بە ووشتر کەوت بەرەڵای ئەکا و پەلاماری ئەو ئەدا. سەگ کلکە لەقێ ئەکا هەتا پارچە نانێکی بۆ فڕێ بدەن. بەڵام فیل کە بە گەورەیی ناسراوە هەتا ڕێزی نەگرن خواردن ناخوا. ئەوەی کە دەستی کورت نەبوو، وە بەسەر بەرزی ژیا ئەگەر تەمەنیشی کەم بوو ناوی نەمرە. بەڵام ئەوەی کە لە دەمی خۆی و ماڵ و مناڵ و کەس و کاری گرتەوە وەك مردووی گۆڕستان وایە. وە ئەوەی کە هەر خەمی وورگی بێ وەك چوارپێ وایە، وە لەڕیزی ئەوان دائەنرێ.

کەلیلە ووتی: تێگەیشتم، بەڵام بزانە کە هەموو کەس پایەی خۆی هەیە کە تیایدا ئەوەستێ. ئێمەش ژیانمان تەواوە و لەهیچمان کەم نییە.

دیمنە ووتی: پایە بە پێی پیاوەتی دانراوە کە پیاو بەرز ئەکاتەوە، بەڵام ئەوەی پیاوەتی تیانەبوو پایەی بەرزیشی هەبوو خۆی سووك ئەکا سەرکەوتن گرانە بەڵام هاتنە خوارەوە سووکە. وەك بەردی قورس کە هەڵگرتنی لەسەر زەوی ناخۆشە، بەڵام دانانەوەی ئاسانە. ئێمەش ئەتوانین بە پیاوەتی خۆمان بەرز بکەینەوە. کەلیلە ووتی: جا بڕیارت چییە؟ (دیمنە) ووتی: ئەمەوێ کە بچمە لای شێرەکە لەم کاتەدا واقی لەکاری خۆی وورماوە منیش بیری خۆمی پێ ئەڵێم، وەپایەم لای ئەو بەرز ئەبێتەوە.

(کەلیلە) ووتی: چۆن ئەزانی کە لەکارو باردا ماوە؟

(دیمنە) ووتی: پیاوی زانا هەر بەڕەنگو ڕوودا لەشت ئەزانێ، (کەلیلە) ووتی: تۆ لای ئەو چۆن شوێنت دەستئەکەوێ کەنایناسی وەهەرگیز کاری پادشایانت نەدیوە؟.

(دیمنە)ووتی: پیاوی بەهێز کۆڵی قورسی بەلاوەگران نییە. هەرچەند کەئێشی ئەونییە، بەڵام بێهێز بەلایەوە قورسە هەرچەندە کە کۆڵ هەڵگرتن پیشەی خۆیەتی .

(کەلیە) ووتی: پادشا پایەی بەرز بەکەسێك ئەدا کە ئەیناسێت و لێی نزیکە. پێشینان ووتوویانە:

پادشا وەك دارمێو وایە بەنزیکترین دارەوە خۆی هەڵئەواسێ. تۆ هیچ پەیوەندییەکت بەوەوە نییە.

(دیمنە) ووتی: ڕاست ئەکەی، بەڵام ئەوەی کە لە پادشاوە نزیکە لەو کەسە پیاوتر نییە کە لە دوورەوە ئەڕوا بۆ لای، وە ماف هەیە. منیش بە تێکۆشان ئەگەمە پایەی ئەوان. پێشینان ووتویانە: ئەوەی کە بچێتە لای پادشا ئەبێ هەموو شتێك بخاتە لاوە، وەهەموو سزاو ناخۆشییەك هەڵبگرێ ئەگینا ناگاتە ئامانج. (کەلیلە) ووتی: ئەوا چویتە لای پادشا بەچییەوە ئەگەیتە پایەی بەرز؟ دیمنە ووتی: کە چوومە لای ئەبم بەدۆستی وەلەگەڵیدا ڕێك ئەکەوم. ئیتر هەرچی ئەو ئارەزوو بکا من وا ئەکەم و بە هەموو زانینمەوە ئامۆژگاری ئەکەم وەڕێی ڕاستی بۆ ئەدۆزمەوە، چونکە پیاوی زانای لەسەرخۆ ئەگەرئارەزوو بکا ڕاست بە درۆ دەرئەکا و درۆ ئەکا بەڕاست. وەك وێنەگری شارەزا کە وێنەی وا لەسەر دیوار ئەکێشێ و قوڵی ئەکاتەوە پیاو وا ئەزانێ کە دەرەوەیە کەچی دەردوەش نییە، وەوێنەی وائەکێشێ وەك ناوەوەبێ وایە کەچی واش نییە. ئیتر منیش هیوام وایە پایە بەرز ببم لای ئەو .

کەلیلە ووتی: هەرچەندە قسەکانت جوان و ڕەوانن، بەڵام من لەپادشا هەر ترست لێ ئەکەم، چونکە هاوڕێیەتی پادشا ترسناکە. زاناکان ووتوویانە: سێ شت هەیە کە پیاوی گەوج و نەزان نەبێ کەس لێیان نزیك نابێتەوە. وەکەم کەس لێیان ڕزگار ئەبێت، هاوڕێیەتی پادشا، وەشاردنەوەی نهێنی لای ژن، وە خواردنی زەهر بۆ تاقی کردنەوە. وە زاناکان پادشایان داناوە بە شاخێکی بەرز کە پڕە لە گەوهەرو زێڕی بە نرخ وەهەموو جۆرە میوەو دەرمانی نایابی تێدایە، لەگەڵ ئەوەشدا شوێنی شێرو پڵنگ و گورگ و هەموو دڕندەیەکە.

ڕۆیشتن بۆئەو شاخە ناخۆش و ترسناکە. وەمانەوە لەوێ ناخۆشترو ترسناکترە. دیمنە ووتی: ڕاست ئەکەی، بەڵام بزانە ئەوەی کە ئازار

نەکێشیٚ خۆشی ناچێژیٚ. وە ئەوەی بترسیٚ ناگا بە ئامانج. زاناکان ووتوویانە: سیٚ کار هەیە کە پیاوی ئازاو لێهاتوونەبیٚ کەس بۆی ناکریٚ کاروباری پادشایی، وە بازرگانی کردنی دەریا، وە لەناو بردنی دوژمن. هەروەها لە بابەت پیاوی ئازاوە ووتوویانە کە لەدووشوێندا ئەبینریٚ، یان لەگەڵ پادشادا کارئەکا، یان لەگەڵ خواپەرستاندا خواپەرستی ئەکا وەك فیل کە جوانی و گەورەیی لەدوو شوێندایە، یان لە کێودا بۆخۆی سەربەستە، یان وولاخی سواربوونی پادشایە .

کەلیلە ووتی: خوا ئاواتەکەت بەجیٚ بێنیٚ.

لەپاشا دیمنە هەستاو چووە لای شێرو سلاوی کرد .شێرەکە بەیەکێك لە دانیشتوانی ووت. ئەمە کیٚ یە؟ ووتی: فلان کوڕی فلانە. شێرەکە ووتی: باوکیم ئەناسی، لەپاشا ووتی: ئێستە لە کوێی؟ (دیمنە) ووتی: هەرلەدەرگای پادشادا کەوتووم بەهیوای ئەوەی کەکارێك بێتە پێشەوەو یارمەتی پادشا بدەم بەهەموو زانینمەوە دەرگای پادشا گەلیٚ فەرمانی تیادایە کە لەوانەیە بەوکەسانە بکریٚ کەوازیان لێهێنراوە وەهیچ شتێك نییە کەبەپێی خۆی چاکەی تیادا نەبیٚ تەنانەت ئەوچڵەچیلکەیەی کە فڕێدراوە کەڵکی هەیە، پیاو هەڵی ئەگریٚ و لەکاتی پێویستیدا بەکاری ئەهێنیٚ.

کە شێرەکە قسەکەی دیمنەی بیست سەری سوڕما وەزانی کە ئامۆژگارییەکی پێیە. ڕوویکردە دانیشتوان و ووتی: پیاوی گەورە کەناوی نییە بەرز ئەبێتەوە و دەرئەکەویٚ وەکوئاگر هەرچەندە کە خاوەنەکەی لێی ئەداو زیاتر کلپە ئەسێنیٚ و بەرزتر ئەبێتەوە. کە دیمنە زانی شێرەکە سەری لێی سوڕماوە ووتی:

دەرگاوانی پادشا هاتۆتە ئێرە بۆئەوەی کە پادشا بزانێ چەند زانینی بەلاوەهەیە هەروەکوو ووتویانە: گەورەیی لە دووکاردایە: گەورەیی شەرکەر بەسەر شەڕکەرەوە، وەگەورەیی زانا بەسەر زاناوە. وەکاربەدەستانی زۆر بەبێ تاقیکردنەوە دوورنییە کەزیانیان هەبێ بۆ کارو بار. ئیش بەکاربەدەستانی زۆر ناکرێ، بەڵکو بەڕاستی و دڵسۆزی کاربەدەستان ئەکرێ. وەك ئەو پیاوەی کە خۆی بە بەردەوە قورس ئەکا، وە هیچ کەڵکی نییە. وە ئەوەی کە ئیشی بەدار هەیە قامیشی زۆر بەکاری نایە. تۆش ئەی پادشا سەیری پیاوێکی هەژار بە سووك مەکە، چونکە دوور نییە کە بچووك گەورە ببێ، وەك سیرمە کە لە مردارەوەبوو ئەکرێتەوە کەکەوانیان لێدرووستکرد ڕێزی ئەگرن وە پادشایان بۆ شەڕوو ڕابواردن بەکاری دێنن.

لەپاشا دیمنە وای بەباش زانی کە ئەوکۆمەڵە تێ بگەیەنێ کە پادشا لەبەر زانایی ئەوبوو ڕێزی لێ گرت، چونکە وایان ئەزانی لەبەر ئەوەبوو کە باوکی ئەسیوە، بۆیە ووتی: پادشا نابێ ڕێزی کەس لەبەر باوکی بگرێ، بەڵکو ئەبێ بەپێی زانین و پیاوەتی ئەوکەسە سەیری بکات، چونکە هیچ شتێك لە لەشی پیاو نزیکتر نییە بەخۆی. وە کە توشی نەخۆشی بوو بەو دەرمانە چاك ئەبێ کە لە دووری خۆیەوە بۆی دێ. کە(دیمنە) قسەکەی تەواوکرد پادشا زۆرسەری لێی سوڕما وەبەڕێزەوە وەڵامی دایەوەو لەپاشا ڕووی کردە دانیشتوان و ووتی:- پێویستە کە پادشا ماف کەس لە دەست نەدا وەهەر شتە لە شوێنی خۆی دابنێ، وە لەمەدا ئادەمیزاد دووجۆرن: پیاوی ڕقاوی‌وخراپ کەوەك مار وایە ئەگەر پیاو پێی پیابنێ و پێوەی نەدا نابێ دەسخەڕۆ ببێ وەدوبارەی بکاتەوە پێوەی بدا. وەپیاوێك کە هەر لەبناغەوە ساردوسڕە

وەك(سەندەڵی سارد)[1] وایە کەئەگەر زۆرت خوراند گەرم ئەبێ و ئازار ئەگەیەنێ.

لەپاشان(دیمنە) دۆستایەتی لەگەڵ شێرەکەدا پەیداکرد، ڕۆژێك دوو بەدوو گفتو گۆیان ئەکرد ووتی: نازانم بۆچی پادشا هەر لەیەك جێدا دائەنیشێ و ناجوڵێ؟ لەم قسانە دابوون، (شەترەبە) بەهەموو هێزییەوە بۆڕاندی، پادشا ڕاچڵەکی بەڵام حەزی نەکرد کە (دیمنە) پێی بزانێ. بەڵام (دیمنە) ووتی: ئایا پادشا ئەو دەنگەی بەلاوە ترسناکە؟ شێرەکە ووتی: بەڵێ لەو دەنگە نەبێ لە هیچ ناترسم.

(دیمنە) ووتی: زاناکان ووتویانە لە هەموو دەنگێکدا ترس نییە، بۆ ئەمەش پەندێك هەیە. شێرەکە ووتی: ئەو پەندەچییە؟ (دیمنە) ووتی: ئەگێڕنەوە ڕێوییەك هاتە دارستانێك تەپڵێکی هەڵواسراوی تیا بوو، کەبا هەڵی ئەکرد دەنگێکی گەورەی لێ پەیدا ئەبوو ئەوناوە دەنگی ئەدایەوە .

ڕێوییەکە بەرەو دەنگەکە ڕۆیشت چاوی کەوت بەتەپڵە زلەکە وای زانی کە هەمووی گۆشت و بەزە، بەڵام کەشکاندی سەیریکرد ناوەکەی بۆشە لەدڵی خۆیدا ووتی:- نازانم لەوانەیە کەدەنگ زلی زەلام لەهەموو شتێك بێ هونەر تربێ. لەبەر ئەوە ئەم پەندەم بۆ ووتی: کە بزانی ئەودەنگەی کەلێی ئەترسی هیچی تیا بەسەر نییە وەئەگەر ئارەزوو بکەی ئەچم و لەو دەنگە ئاگادارت ئەکەم. شێرەکە ووتی: باشە بڕۆ. کە (دیمنە) چوو بۆلای (شەترەبە) شێرەکە لەدڵی خۆیدا ووتی: ئیشێکی خراپم کرد کەدیمنەم نارد بۆلای خاوەنی ئەو دەنگە. (دیمنە)

---

[1] سەندەڵ = دارێکی بۆن خۆشە

دەرگاوانی من بوو ئیتر ماف چی هەیە؟ لەوانەیە کارەساتێکی بەسەردا هاتبێ؟ وە ژیانی تاڵ کردبێ کە هاتۆتە ئێرە یان زۆریان لێکردبێ یان تاوانێکی کردبێ و لەسزای بترسێ ئەمەڕاستنەبوو کەمن لەودڵنیابووم و ناردم بۆلای خاوەنی ئەودەنگە، چونکە (دیمنە) زۆرزان و ترسناکە، لەدەرگای مندا بەسووکی کەوتبوو دوورنییە لەبەر ئەوە ڕقی لەمن نەبێ وەناپاکیم لەگەڵدا نەکا. ڕەنگە ئەو خاوەن دەنگە لە من بە بەهێزتر ببینێ و وەیارمەتی بدا وەتووشی خراپەیەکم بکەن.

لەپاشا لە جێی خۆی هەستاو سەیری کرد کە (دیمنە) هاتەوە زۆری پێ خۆش بوو. لێی پرسی: چیت کرد؟

(دیمنە) ووتی: چاوم کەوت بەگایەك کە خاوەنی ئەو دەنگە بوو.

شێرەکە ووتی: هێزی چۆنە. (دیمنە) ووتی: هیچ نییە چووم هەڕەشەم لێکرد کەچی نەی وێرا قسەبکا. شێرەکە ووتی: بەوە دەسخەڕۆمەبە. (ڕەشەبا) کارناکاتە سەر چڵەپووشی باریك کەچی گەورەترینی دار ئەشکێنێ. (دیمنە)ووتی: پادشام هیچ مەترسە هەرئێستا ئەچم و ئەیهێنمە بەردەست و ئەیکەم بەبەندەیەکی گوێڕایەڵی تۆ. شێر ووتی: ئادەی بزانم چی ئەکەی؟ (دیمنە) چووەوە بۆلای گاکە وەبێ ترس پێی ووت: شێر ناردوومی بۆلات کەئەگەر زوو بڕۆی بۆلای لە گوناهی پێشووت خۆش ببێ وەئەگەر سستی بکەی بگەڕێمەوە وپێی بڵێم:

(شەترەبە) ووتی: ئەوشێرە کێیە؟ (دیمنە) ووتی: پادشای دڕندەیە، لە فلان شوێنەو سەربازی زۆری لەجۆری دڕندە لەگەڵدایە (شەترەبە) کە ناوی شێرو دڕندەی بیست زۆر ترساو ووتی: ئەگەر تۆ دڵنیام ئەکەی لەگەڵت دێم. (دیمنە): پەیمانی دایە کەتووشی هیچ نە بێ. وە لەگەڵ

گاکەدا هاتەوە بۆلای (شێر). شێرەکە ڕێزی لێ گرت و لێی پرسی: کەی هاتویتە ئەم خاکە؟ (شەترەبە) بەسەر هاتی خۆی بەتەوای بۆ گێڕایەوە. شێرەکە ووتی: تۆ هاوڕێی منبەو لەمن جودا مەبەرەوە من ڕێزت نەگرم. گاکەش سوپاسی کرد. شێرەکەش ئیتر گاکەی لەخۆی نزیککردەوە، وە لەکاروباری خۆیدا پرسی پێ ئەکرد و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر سەری لە زانین وتێگەیشتنی سوڕئەما وەزیاتر ڕێزی ئەگرت هەتا (شەترەبە) بوو بە بەرزترینی هاوڕێی شێر.

کە (دیمنە) ئەوەی دی زۆری پێ ناخۆش بوو، ڕقی لە گاکە هەستا، و ئەو ڕقەی خواردەوە. لەپاشا چوو بۆلای (کەلیلە)ی برای و سکاڵای خۆی کرد ووتی: برا بڕوانە چیم بەخۆم کرد وەچۆن بە نەزانی گایەکم هێنا و پلەوپایەمی داگیرکرد ( کەلیلە) ووتی: ئێستا تۆ نیازت چییە؟ (دیمنە) ووتی: ئیتر من نیازم نییە کە پایەم لەجاران بەرزتر بێ، بەڵام چارەیەك ئەدۆزمەوە پێی بگەمەوە پایەی ئەوسام.

سێ شت هەیە کە پیاو ئەبێ فێڵی بۆ بدۆزێتەوە:

یەکەم: سەیری زیانی ڕابردووی بکاو جارێکی تر تووشی ئەو زیانە نەبێ، وە هەوڵی گەڕانەوەی قازانجی کۆن بدا.

دووەم: هەمیشە سەیری قازانج و زیانی ئێستای خۆی بکا و ئاگای لە خۆی بێ.

سێ یەم: بە ووردی سەیری دوارۆژی خۆی بکا بەهیوای کەڵك وەرگرتن و هەوڵی ئەم جۆرە شتانە بدا .

منیش هیچ چارەم نییە لەگەڕانەوە بۆسەر پایەی جارانم بەکوشتنی ئەم پووش خۆرە نەبێ. وە لەوانەیە کە ئەم کارە سوودی شێرەکەشی

تیادابێ، چونکە ئەوەندە ڕێزی لێگرتووە کەنزیکە تووشی کارەساتێکی بکا (کەلیلە) ووتی: باوەڕ ناکەم (گاکە) لەو پایە بەرزەدا هیچ زیانێکی بۆشێر هەبێ(دیمنە) ووتی: پادشا لەکاری خۆیدا بەهۆی شەش شتەوە سەری لێ تێك ئەچێ:

یەکەم: دوور خستنەوەی ڕۆشن بیران و پیاوانی بەرز و کار بەدەستانی گەورە.

دووەم: خستنەوەی دووبەرەکی کە شەڕوو هەرا پەیدا ئەکا لەناو ئادەمیزاددا.

سێ یەم: ڕابواردنی زۆر وەك خواردنەوەو ڕاووشکار و دڵداری و پێکەنین، وە ئەم بابەتانە.

چوارەم: دڵڕەقی کە ئەگاتە ڕادەی جنێودان و دەست وەشاندن کە لەشوێنی خۆیدا نەبێ.

پێنجەم: کاروباری ڕۆژگار لە شەڕو شۆڕو گرانی و مردن.

شەشەم: گەوجی، کە ئەویش بەکار هێنانی توندییە لە کاتی نەرمی وە نەرمی لە شوێنی توندیدا. وە شێر گاکەی زۆر خۆش ئەوێ هەر ئەوەیە کە پێم ووتی: دوور نییە کە تووشی کارەساتێکی خراپی نەکا (کەلیلە) ووتی: تۆ چۆن دەرەقەتی ئەو گایە دێی کەلەتۆ بەهێزترە، وە لای شێر لەتۆ خۆشەویستترە؟ (دیمنە) ووتی: سەیری بێهێزی و بچوکیم مەکە، ئیش بەگەورەیی و بچوکی نییە، گەورەیی و بچووکی لە بەهەشتانین. دوور نییە کەهەژارێکی داماو بەزیرەکی و فێڵ کاری وابکا کە زۆر لەپیاوانی خاوەن دەسەڵات نەتوانن بیکەن، وەك ئەوقەلە ڕەشکە بێ دەستەڵاتەی کە ڕەش مارێکی گەورەی بە فێڵ لەناو برد.

(کەلیە) ووتی ئەوە چۆن بووە؟ (دیمنە) ووتی:

ئەگێڕنەوە قەلە ڕەشکەیەك هێلانە لە نزیك کونی ڕەش مارێکەوە دروست ئەکات، وە هەر بەچکەیەك ئەکا مارەکە ئەیخوات. ئەویش ئەم کارەساتە بۆ چەقەڵێك ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ: نیازم وایە کەنوست بچم هەردوو چاوی هەڵبکۆڵم. چەقەڵەکە وتی نەء ئەوە بەکاری هیچ نایەت کارێکی وابکە کەڕەش مارەکە لەناوببەی بەبێ ئەوەی کە خۆت توشی هیچ ببی، ئاگات لە خۆت بێ وەك (ماسی گرە)[1]ت بەسەردا نەیەت کە ئەیویست (قرژاڵ) بکوژێ کەچی خۆی دا بەکوشت .

قەلە ڕەشەکە وتی: ئەوە چۆن بووە؟ چەقەڵ وتی:

ئەگێڕنەوە(ماسی گرەیەك) هێلانەیەك لە دارستانێکی خاوەن قامیش وئاودا درووست ئەکا. لەپاشا پیر ئەبێ و توانای ڕاوکردنی ماسی نامێنێ. لەبەر ئەوە بیر لە دۆزینەوەی چارەیەك ئەکاتەوە

(قرژاڵێك) لەوێوەوە ئەڕواو لێی ئەپرسێ، بۆچی واداماوی ئەی باڵندە؟ (ماسی گرە) ئەڵێ: خەفەت بۆمن باشە. ئەمڕۆ دوو ڕاوچیم دی یەکێکیان وتی: ئێرە ماسی زۆرە باڕاویان بکەین ئەویش ووتی: سبەینێ دێینە ئێرە، هەرچی ماسی تیادایە ڕاوی ئەکەین.

منیش زانیم کە بەیانی دێنە ئێرەو ماسی لێ ئەبڕن. ژیانی منیش لەسەر ماسی یە ئیتر لەبرسان ئەمرم. قرژاڵەکە چوو بۆلای ماسی یەکان وەتێی گەیاندن ئەوانیش بەجارێك هاتن بۆلای (ماسی گرە)و ووتیان: چارەیەکمان بۆبدۆزەرەوە چونکە مرۆڤی ژیرودانا پرس بەدوژمنانیشی ئەکا. ماسی گرەکە ووتی: دەسەڵاتم بەسەر ڕاوکەرانا نییە بەڵام گۆمێك لێرەوە نزیکە بگوێزنەوە بۆئەوێ ڕزگارتان ئەبێ. ووتیان: لە تۆ زیاتر

---

[1] ماسی گرە - باڵندەیەکی سپی یە

کەسمان دەست ناکەوێ کەئەوفەرمانەمان بۆ جێبەجێ بکا. (ماسی گرەکە) ڕۆژی دووماسی لێ هەڵئەگرتن و ئەی برد بۆسەر گردێك و لەوێ ئەیخواردن. ڕۆژێك کەهات بۆگوێزانەوەی ماسی (قرژاڵەکە) ووتی: منیش ئەترسم، حەزئەکەم بگوێزمەوە بۆ ئەو گۆمە. ئەویشی هەڵگرت، کە لە گردەکە نزیك بووەوە، قرژاڵەکە چاوی کەوت بەئێسقانی ماسی تێگەیشت کەئەیەوێ ئەویش بخوات لەدڵی خۆیدا ووتی: ئەگەر پیاو گەیشتە دوژمن لەشوێنێکی وادا کەلێی ڕونە شەڕبکا یاننەیکا ئەکوژرێ. هەر شەڕ بکات چاکترە لەبەرسەربەرزی و ڕێزی خۆی. لەپاشا قەپی کرد بە ملی ماسی گرەکەداو ئەوەندەی گوشی هەتا مرد لەپاشا قرژاڵەکە چووەوە بۆلای ماسییەکان و لەوکارەساتە ئاگاداری کردن. منیش لەبەر ئەوە ئەم ئامۆژگارییەم کردی کەبزانی هەندێ فێڵ هەیە کە فێڵباز لەناو ئەبا. من چارەیەکت پێ ئەڵێم کەڕەش مارەکەش بکوژی بەبێ ئەوەی کە خۆت توشی هیچ ببیت.

قەلە ڕەشەکە ووتی: ئەو چارەیە چییە؟ (چەقەڵ) ووتی: بزانە هەندێ خشڵی ژنان پەیدا بکە وەبەهەوادا بفڕە کەچاویان لێت بێت. لەپاشا لە نزیك کونی مارەکە فڕێی بدە. قەلە ڕەشەکە بە هەوادا ئەفڕی و چاوی کەوت بەژنە دەوڵەمەندێك کەلەسەربان جلەکانی داکەندبوو خەریکی خۆشتن بوو، ملوانکەیەکی فڕاند منداڵ و گەورە شوێنی کەوتن هەتالای کونی ڕەش مارەکەو لەوێدا فڕێیدا ئەوانیش کەهاتن چاویان بەمارەکە کەوت کوشتیان وەملوانکەکەشیان هەڵگرت. لەبەر ئەوە ئەم قسانەم بۆکردی کەبزانی فێڵ کاری وائەکا کە هێزو دەستەڵات بۆی ناکرێ.

(کەلیلە) ووتی: بەڵام گاکە لەگەڵ بەهێزیدا زیرەك و تێ گەیشتووە ئەگەر وانەبوایە وەك تۆ ئەڵێی وابوو ئیترتۆ فێڵی چی لێ ئەکەی؟

(دیمنە) ووتی: گاکە هەرچەندە زاناو بە دەستەڵات بێ خۆی دان بە گەورەیی مندا ئەنێ، وە من ئەتوانم کەلەناوی ببەم وەك ئەو کەروێشکەی کە شێرێکی لەناو برد.

(کەلیلە) ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ (دیمنە) ووتی:

ئەگێڕنەوە شێرێك لە دارستانێکی ئاوداردا ئەژیا کە پڕبوو لە هەموو جۆرە گیانەوەرێك، بەڵام لەترسی ئەوشێرە نەیان ئەوێرا دەرکەون، ڕۆژێك کۆئەبنەوەو ئەچن بۆلای و پێی ئەڵێن: ئەی پادشا تۆزۆر خۆت ماندوئەکەی بەشوێن نێچیردا، ئێمەش چارەیەکمان دۆزیوەتەوە کە چاکەی تۆو ڕزگاری ئێمەی تیادایە. ئەگەر تۆ ئیتر نەمانترسێنێ هەموو نیوەڕۆیەك چوار پێیەکت لە خۆمان بۆ ئەنێرین کە بیخۆی. بەم جۆرە لەگەڵ شێرەکەدا ڕێکەوتن. ڕۆژێك نۆرە هاتە سەر کەروێشکێك کەببێ بە خۆراکی نیوەڕۆی شێر، کەروێشکەکە بە گیانەوەرەکانی ووت: ئەگەر بەقسەم بکەن لەوشێرە زۆردارە ڕزگارتان ئەکەم. ووتیان: ئەڵێی چی؟ ووتی، بەو کەسە بڵێن کەئەمبا بۆلای تۆزێ لە کاتی خۆی درەنگتر بمبا لەپاشا خۆم ئەچمە لای ئەوانیش ووتیان باشە، کەروێشکەکەیان دواخست لەپاشا بەتەنها ناردیان بۆلای کەزۆر برسی بوو. شێرەکە نەڕاندی بەسەریا ووتی: هەتا ئێستا لە کوێ بوی.

ووتی: من زیندەوەرەکان ناردمیان وەکەروێشکێکم لەگەڵ خۆمدا بۆ هێنابووی کە بیخۆی. لە ڕێگادا شێرێك لێی سەندم و ووتی: منم

پادشای ئەم ناوچەیە. هەرچەند لێی پاڕامەوە سوودی نەبوو جنێویشی بەتۆدا.

شێرەکە ڕقی هەستاو ووتی: وەرە لەگەڵم شوێنی ئەو شێرەم نیشان بدە، کەروێشکەکە شێرەکەی بردە سەر بیرێکی قوڵ و ووتی: شێرەکە لێرەدایە، شێرەکە سەیری ناو بیرەکەی کرد کەئاوی وەستاوی تیابوو خۆی تیادیو بەوشێرەی تێگەیشت کە کەروێشکەکە باسی بۆکردبوو. دەستبەجێ خۆی بۆفڕێدایە ناوبیرەکەو ملی شکاومرد. کەروێشکەکەش گەڕایەوە بۆلای هاوڕێکانی وەئەوەی بە شێرەکەی کرد بۆی گێڕانەوە.

(کەلیلە) ووتی: ئەگەر ئەتوانی گاکە لەناو ببەی بەشتێك هیچ زیانێکی بۆ شێر تیانەبێ ئارەزووی خۆتە. چونکە گاکە زیانی بەمن و تۆو هەموو سەربازەکانی تریشی گەیاندووە، وە ئەگەر ئەوکارەت بەلەناو بردنی شێرەکە نەبێ بۆت نەکرێ مەیکە چونکە ناپاکییە لە منو تۆوە بەرامبەر بە شێر.

لەپاشا (دیمنە) چەند ڕۆژێك هاتوچۆی شێرەکەی نەکرد ڕۆژێك کە تەنها بوو چووە لای، ئەویش ووتی: دیارنیت یاخواچاك بێ.

(دیمنە) ووتی: باوابێ ئەی پادشا. شێرەکە ووتی هیچ ڕویداوە؟

(دیمنە) ووتی: شتێك بووە کەنەپاشا حەزی لێ ئەکا وەنە سەربازەکانی پادشا. شێرەکە لێی پرسی ئەو ڕوداوە چی یە؟

(دیمنە) ووتی: قسەیەکی ناخۆشە کە پیاو ناوێرێ بیڵێ. تۆ ئەی پادشا زاناو تێگەیشتووی، خۆت ئەزانی کەمن حەزناکەم قسەیەك بکەم بەلاتەوە گران بێ. وەخۆت ئەزانی کەمن چۆنم بۆتۆ کەلەڕێی تۆدا هەمیشە ئامادەبووم خۆم بەخت بکەم. بەلام وا ئەزانم کە تۆ باوەڕم پێ،ناکەیت لەوەی کەپێت ئەڵێم منیش کەبیرم کردەوە کەئێمە کۆمەڵێ

گیانەوەرین ژیانمان بەستراوە بەتۆوە ئیترچارەم نەما لەدەربڕینی مافێك کە لەسەرم پێویستە، هەر چەندە کە تۆش پرسیارت لێ نەکردووم. من تائێستا لەوە ئەترسام کەقسەکانم وەرنەگریرێ، پێشینان ووتوویانە: ئەوەی کە ئامۆژگاری لەپادشا وەبیرو ڕای لە برادەر شاردەوە ناپاکە بە خۆی.

شێرەکە ووتی: ئەوقسەیە چییە؟

(دیمنە) ووتی: لە پیاوی ڕاستم بیستووە کە(شەترەبە) لای سەربازەکانت ووتوویەتی: شێرم تاقیکردۆتەوە و هەموو فێڵ و هێزوو شارەزاییەکیم زانیوە کەچۆن لەپاشەڕۆژدا پەکی ئەکەوێ. ئەوکاتە من و ئەو چاومان بەیەکتر ئەکەوێ، منیش زانیم کە(شەترەبە)ناپاکو بەدخووە، تۆ چاکەت لەگەڵ کرد کەکردت بەهاوڕێی خۆت کەچی وا ئەزانێ کە ئەو وەکو تۆ وایە، وەهیوای هەیە کەلەپادشایی لاچوویت ئەو بێتە شوێنەکەت. شەترەبە هیچ نەماوە کەلەتۆوە فێری نەبووبێ. پێشینان ووتوویانە: پادشا کەزانی پیاوێك وەك ئەو گەورەو بە دەستەڵات بووە، ئەبێ لەناوی ببا ئەگینا خۆی لەناو ئەچێ، (شەترەبە) زۆرزانەو کارو بار چاك ئەبا بەڕێوە.

تێگەیشتوو ئەوکەسەیە کەچارە بۆئیش لە پێش هاتنیا ئەدۆزێتەوە. ئەی پادشا دڵنیامەبە لەوکارەساتەی کە ڕووئەدا وەتۆ ئاگات لەخۆت نییە.

پێشینان ووتوویانە: پیاوان سێ جۆرن: نەبەز، ئازا، بەزیو. پیاوی نەبەز ئەویە کەکارەساتێکی بەسەردا هات ناشڵەژێ و پەکی ناکەوێ وە چارەی ڕزگاربوونی لەبیر ناچێ. ئازاش ئەوەیە: کەکارەسات بەگەورە

ئەگرێ و لەپێش ڕوودانیا چارەی بۆ ئەدۆزێتەوە. دەردەکە لائەبا لەپێش توشبوونیا وەبەربەکارەسات ئەگرێ لە پێش هاتنیا.

بەڵام بەزیو هەر لەبیرکردنەوەو دوودڵی و تەمەڵیدایە هەتا لەناو ئەچێ، بۆئەمانەش سەر گوزشتەی سێ ماسی هەیە. شێرەکە ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ (دیمنە) ووتی: ئەگێڕنەوە گۆمێك سێ ماسی تیادا ئەبێ کەئەمانە بوون: زانا، زۆرزان، نەزان، ئەو گۆمە لقی ڕووبارێکی گەورەبوو. ڕۆژێك دووڕاوچی لەڕووبارەکەیان داو چاویان بەگۆمەکە کەوت بڕیاریاندا کەبۆی بگەڕێنەوە و هەرچی ماسی تیادایە ڕاوی بکەن. زۆرزانەکە دەستبەچێ لەگۆمەکەوە خۆی گەیاندە ڕووبارەکە، وە ئاوری لەهیچ نەدایەوە. ماسیە زاناکەش جارێ لەشوێنی خۆیدابوو، کە چاوی بەڕاوکەرەکان کەوت خێرا ویستی لەئاوی گۆمەکەوە خۆی فڕێ بداتە ڕووبارەکەوە، بەڵام سەیری کرد کە ئەو شوێنەیان گرتووە، لە دڵی خۆیا ووتی: ئەمە ئەنجامی تەمەڵییە.

ئیشی پەلەو ترس کەم سەر ئەکەوێ، بەڵام مرۆڤی زانا هەرگیز خەفەت ناخوا، لە دۆزینەوەی چارە وەڕس نابێ. لەپاشا خۆی کرد بەمردوو، وە کەوتە سەر ئاوەکە تاوێك لەسەر سك و تاوێك لەسەر پشت خۆی هەڵ ئەگێڕایەوە، ڕاوچییەکان وایانزانی مردووە، گرتیان و لە نێوانی ڕووبارو گۆمەکەدا دایان نا. لەپڕ بازێکیداو خۆی فڕێدایە ناو ڕووبارەکە و ڕزگاری بوو، بەڵام نەزان هەر لەگۆمەکەدا هاتوچۆی ئەکرد هەتا ڕاویان کرد. شێرەکە ووتی: ڕاست ئەکەی، بەڵام باوەڕناکەم کە گاکە هیچ خراپەیەك دەربارەی من بکا، چونکە ئەوەتەی لای منە هیچ خراپەکم دەربارە نەکردووە، وەهیچ کارێکی نەبووە بۆم جێبەجێ نەکردبێ.

(دیمنە) ووتی: پیاوی ناپاك خۆی چاك نیشان ئەدا هەتا ئەگاتە پایەیەك کە نەی دیوە، ئیتر هەوڵ بۆبەرزتر ئەدا.

ئەو جۆرە کەسانە لەترسانەبێ یارمەتی پادشا نادەن وەکە ترسیان نەما ئەچنەوە سەرباری جارانیان. وەکو کلکی سەگ کە ئەیبەستن بۆئەوەی ڕاست بێ. هەتا بەستراوە هەر ڕاستە، بەڵام کەکردیانەوە خوار ئەبێتەوە.

ئەی پادشا بزانە ئەوەی کە قسە وەر نەگرێ ژیرنییە، چونکە وەك نەخۆشێك وایە کەبە قسەی پزیشك ناکا، وە ئەو شتانە ئەخوا کەخۆی حەزیان لێ ئەکا. لەسەر هاوڕێیانی پادشا پێویستە کەئامۆژگاری پادشا بکەن، وە ڕێی چاك و خراپی پێ نیشان بدەن کەخۆی لەچاکە نزیك بکاتەوەو لەخراپەش دووربکەوێتەوە. زاناکان ووتویانە: چاکترین هاوڕێ ئەوەیە کەهەرگیز ئامۆژگاری نەشارێتەوە وەچاکترینی ژن ئەوەیە کەلەقسەی مێرد دەرناچێ، وەچاکترینی کار ئەوەیە کە پاشەڕۆژی چاکە، وەچاکترینی سوپاس و ستایش ئەوەیە کەلەدەمی پیاو چاکەوە دەرئەچێ. وەچاکترینی پادشا ئەوەیە کەهاوڕێی لە خۆبایی نییە، وەچاکترینی ڕەوشت ئەوەیە کەپیاو لەخراپە ئەگێڕێتەوە و توشی چاکەی ئەکا.

پێشینان ووتویانە: ئەوەی کەئاگر سەرینی بێ و مارو مێرو ڕاخەری بن، گۆڕی ئەوەیە هەرگیز خەو لەچاوی نەکەوێ. پیاو ئەگەر هەستی بە دوژمنایەتی کرد لەبرادەری خۆی لێی دڵنیانابێ، پادشای بێدەستەڵات ئەوەیە کەئیشی خۆی بەهیچ نەزانێ، وەبیر لەدواڕۆژ ناکاتەوە، هەروەکو فیلی شێت کە ئاوڕ لەهیچ ناداتەوە هەر مل ئەنێ کەتوشی

کارێکی سەخت بوو گوێی ناداتێ ، وە کە کاتی تۆڵە سەندنی لە کیس چوو پەلاماری هاورێکانی ئەدا و بە گوناهی ئەوانی ئەزانێ.

شێرەکە ووتی: قسەی ڕەقت کرد، وە قسەی ئامۆژگاریکەر لەسەر سەرم، بەڵام ئەگەر (شەترەبە) دوژمنایەتی لەگەڵ مندابکات هیچی پێ ناکرێ، چونکە ئەو پوش خۆرەو من گۆشت خۆرم. ئەو خواردنی منەو من لەو ناترسم. وە ئەو ماف نییە کە دوژمنایەتیم لەگەڵدا بکات لەپاش ئەوەی کە ڕێگەمدا هاتۆتە ئێرە دڵنیامکردو ڕێزم لێ گرت ئەگەر لەو پەیمانەم کە داومەتێ ناپاکیم کرد بزانە کەپیاوێکی زۆردارو خراپم هۆشم لە خۆم نەماوەو پەیمانم لانییە.

(دیمنە) ووتی: ئەم قسەیە لەۆتت بایی نەکا کە ئەڵێی ئەو خۆراکی منەو من لەو ناترسم. شەترەبە ئەگەر خۆی نەتوانێت هیچت دەربارە بکات هاورێکانت لێ هان ئەدا.

(پێشینان) ووتوویانە: ئەگەر میوانێکی نەناسراو یەك (سەعات) لە ماڵەکەتا مایەوە، دڵنیامەبە کەبەهۆی ئەوەوە ئەوەت بەسەرابێ کەبەسەر ئەسپێداهات بەهۆی کێچەوە. شێرەکە ووتی: ئەوە چۆن بووە؟

(دیمنە) ووتی:

ئەگێڕنەوە(ئەسپێ یەك) ئەچێتە جلو بەرگی پیاوێکی دەوڵەمەندەوە ماوەیەکی زۆر لەخوێنی ئەخوا وەبەهێواشی ئەجوڵێتەوە کەئەو نوستووەو ئاگای لە خۆی نییە. شەوێك (کێچێك) ئەبێ بە میوانی، ئەویش پێی ئەڵێ ئەمشەوە لێرەبە خوێنی پاك بخۆو لە جێگای نەرما بنوو. ئەویش ئەمێنێتەوە. شەو کابرا ئەیەوێ بخەوێ، (کێچەکە) گازێکی لی ئەگرێ و خەوی لی ئەزڕێنی. فەرمان ئەدا کە جلەکانی بگەڕێن کە سەیری ناو جلەکانی ئەکەن (ئەسپێکە) ئەدۆزنەوە بە نینۆك

ئەی کوژن. (کێچەکەش) ڕائەکا. لەبەر ئەوە ئەم ئامۆژگارییەم کردی کە بزانی پیاوخراپ کەس لە دەستی ڕزگار نابێ هەر چەندە کە هەژارو داماویش بێ شەڕێك لەگەڵ خۆیا دێنێ. ئەگەر تۆ لە شەترەبە ناترسی لەسەربازەکانت بترسە کە(شەترەبە) لە تۆی هانداون.

قسەی (دیمنە) کاری لە شێرەکە کرد ووتی: جاچارە چی یە؟

دیمنە ووتی: دانی کلۆر ئازاری خاوەنەکەی هەرئەدا هەتاهەڵی نەکەنێ لەکۆڵی نابێتەوە، وەخواردنی بۆگەنی ناوسك فرێدانی حەسانەوەیە، وەدوژمنی ترسناك دەرمانی کوشتنە. شێرەکە ووتی: بەڕاستی شەترەبەت لەپێش چاو خستم، ئێستە ئەنێرم بەشوێنیا، وە هەرچی ئەزانم پێی ئەڵێم و فەرمانی پێ ئەکەم بۆ کوێ ئەچێ بابچێ.

(دیمنە)ئەوەی پێ ناخۆش بوو، وەزانی کە ئەگەر شێرەکە قسەی لەگەڵ گاکە کرد لەوبابەتەوە درۆو دوزمانی ئەوی بۆ دەرئەکەوێ، وە هەروا بە ئاسانی لەم کارە دەرناچێ. لەبەر ئەوە بە شێرەکەی ووت:

ئەم کارە بەباش نازانم. خۆشت سەیری ئەوە بکە کەکارێکی پیاوانە نییە، کە(شەترەبە) ئەمەی زانی ئەترسم کە بەزۆرە ملێ بێتە سەرت، ئەمەش جوان نییە.

چونکە ئەو ئەگەر شەڕ بکا خۆی ئامادە ئەکا، وە ئەگەر بە جێیشی هێشتی بە جۆرێك ئەڕوا کە بەهۆی ئەوەوە سووك ببی، ئەوەش بزانە کە پادشای تێگەیشتوو هەرگیز سزای کەسێك نادات کە گوناهەکەی دەرنەخا، بەڵام بۆ هەموو گوناهێك سزایەکیان داناوە. بۆ گوناهی ئاشکرا سزای ئاشکرا، وە گوناهی نهێنی سزای نهێنی. شێرەکە

ووتی: ئەگەر پادشا سزای کەسێك بدا بەبێ ئەوەی کە هیچی لێ دیبێ گوناهێکی گەورەی کردووە.

(دیمنە) ووتی: لەسەر ئەم قسەیەی خۆت کە شەترەبە هاتە لات ئەبێ ئاگات لەخۆت بێ. من ئەزانم کە هاتە لات چ کارەساتێکی گەورەی لەژێر سەرایە، نیشانەشی ئەوەیە کەڕەنگی تێك چووە، وە ئەی بینی کە هەموو لەشی ئەلەرزێ، وەبەڕاست و چەپا ئاوڕ ئەداتەوە، وە شاخی با ئەدا هەروەك کەسێك کە بۆ کوشتار هاتبێ.

شێرەکە ووتی: ئەگەر ئەوانەم لێ دی باوەڕ ئەکەم کەڕاست ئەکەی وەهیچ درۆی تیا نییە.

کە (دیمنە) لێ بووەوە لە هاندانی شێرەکە لە گاکە، وە زانی باوەڕی کردووەو خۆی لێ ئەپارێزێ ئینجا ویستی کەگاکەش دەسخەڕۆ بکاو لە شێرەکەی هان بدا. بەڵام حەزی نەکرد کە هەر لەخۆیەوە بچێ بەبێ فەرمانی شێرەکە و بەوە توشی زیان ببێ، لەبەر ئەوە ووتی:

پادشام بۆنەچمە لای گاکە بزانم چی لەژێرسەردایە؟ لەپاشا دێم ئاگادارت ئەکەم. شێرەکە ووتی: باشە برۆ (دیمنە) چووە لای (شەترەبە) وەك کەسێکی خەفەتبار. ئەویش ئەوی دی زۆری پێ خۆش بوو ووتی: ئەوە بۆچی دەمێکە سەرمان لێ نادەی یاخوا ڕزگار بی.

(دیمنە) ووتی: کەی ئەوکەسە ڕزگارە کە خاوەنی خۆی نەبێ و کارو باری بەدەستی بێگانەوەبێ، وە هەمیشە لەترس وسزادا بێ (شەترەبە) ووتی: بۆچی هیچ بووە؟

(دیمنە) ووتی: ئەوەی کە ئەبێ هەرببێ بووە، کێیە کەبەسەر ڕۆژگاردا زاڵبووە؟ کێیە کە گەورە بووە لە خۆی بایی نەبووە؟ کێیە کە هیوای دەست کەوتووە و بە خۆی نانازێ؟

کێیە کە شوێنی ئارەزوو کەوتووە و خراپەی تووش نەبووە؟ کێیە کە بووە بە هاوڕێی پیاو خراپ و هەروا بە ئاسانی دەرچووە؟ کێیە کە هاوڕێی پادشایەو هەتا سەر بەبێ ترس ژیاوە؟

(شەترەبە) ووتی: وادیارە کەتۆ لەبابەت کارێکەوە لە شێر ئەترسی.

(دیمنە)ووتی: بەڵێ. بەڵام لەخۆم ناترسم (شەترەبە) ووتی: ئەی لەکێ ئەترسی؟

(دیمنە) ووتی: خۆت ئەزانی کە من چۆنم بۆتۆ، وەئەو ڕۆژەت لە بیرە کە پەیمانەکەم لەگەڵ کردی کەهیچت توش نەبێ، ئەوڕۆژەی کە شێرەکە ناردمی بۆلات، لەبەرئەوپەیمان وسوێندە ئەبێ هەر پارێزگاریت بکەم و ئەوەی کە بیستوومە لەبابەت تۆوە بۆتی بگێڕمەوە (شەترەبە) ووتی: چیت بیستووە؟

(دیمنە) ووتی: لە کەسێکی ڕاستگۆم بیستووە کە هەرگیز درۆ ناکا، شێرەکە لای سەربازەکان ووتوویەتی:

سەرم لەقەڵەوی گاکە سوڕماوەومن ئیشم پێی نەماوە ئیتر ئەی کوژم و هاوڕێکانمی لێ تێر ئەکەم. منیش زانیم کە ناپاکە بەرامبەر ئەو پەیمانەی کەکردی لەگەڵتا، ئیتر هاتم کە چارەیەك بدۆزیتەوە.

(شەترەوبە) بیری پەیمان و سوێندی (دیمنەی) کردەوە، وای زانی کەڕاست ئەکا، وە ئەم کارە وەك (دیمنە) ئەڵێ وایە. زۆری پێ ناخۆش بوو ووتی: نابێ شێر دەربارەی من خراپە بکا لەوکاتەوە کە هاتومەتە ئێرە هەتا ئێستا خراپەیەکم نەبووە، وا ئەزانم بەهەڵەدا چووە، چونکە کۆمەڵێکی خراپ هاتوچۆی ئەکەن وەدرۆی وای بۆ ئەکەن کە کەسی تر نایکا.

دۆستایەتی پیاو خراپ پیاو والیٚ ئەکا کەدڵ لەهەموو کەسیٚکی چاك پیس بکا، وەبەهەڵەیدابیا وەك هەڵەی مراوییەکە کەئەگیٚڕنەوە لە چەمیٚکدا شەوقی ئەستیٚرەیەکی بینی، وایزانی کەماسییە چەندجاریٚك چووە ناو ئاوەکەوەو تاقیکردەوە و زانی کە ئەوە شتیٚك نییە ڕاو بکریٚ، ڕۆژی دوایی لە ئاوەکەدا ماسییەکی دی وایزانی کە ئەویش وەکو ئەوەی دوێنی وایە، وازی لیٚ هیٚنا و ڕاوی نەکرد.

ئەگەر شیٚرکە درۆیەکی لەبابەت منەوە بیستبیٚوبەوە باوەڕی کردبیٚ ئەو کاتە دوورنییە کەبیەویٚ زیانم پیٚ بگەیٚنی، وەئەگەر هیچی نەبیستبیٚ و هەر لە خۆیەوە بیەویٚ تووشی زیانم بکا بەڕاستی شتیٚکی زۆر سەیرە.

پیٚشینان ووتوویانە: سەیر ئەوەیە کە پیاو داوای ڕەزامەندی لەهاوڕیٚکەی بکا کەچی ڕازی نەبیٚ، لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە توڕەیش بیٚ. ئەگەر توڕە بوون لەبەر شتیٚك بیٚ، پیاو هیوای لیٚخۆشبوونی هەیە، بەڵام ئەگەر لەبەر هیچ نەبیٚ هیوانامیٚنیٚ، چونکە ئەگەر کردنی کاریٚك توڕەبوون بخاتەوە، لیٚبڕانی ئەو ارە هیوای لیٚخۆش بوون تازە ئەکاتەوە.

من هەرچەندئەکەم خراپەیەك شك نابەم کەدەربارەی شیٚرەکەم کردبیٚ، بە گیانی خۆم هیچ کەسیٚك لە جیهاندا نییە کەبتوانیٚ لە هەموو شتیٚکدا دڵی هاوڕیٚ ڕابگریٚ و لە گەورەو بچووکدا لەگەڵیدا بگونجیٚ، وە هەرگیز کاریٚك نەکا کە ئەو پیٚی ناخۆش بیٚ. بەڵام پیاوی زانا ئەگەر هاوڕیٚکەی هەڵەیەکی کرد سەیری ئەکاو ئەزانیٚ کە هەڵەکەی چەندە، ئایا بە ئارەزوو کردوویەتی یان لە دەستی دەرچووە؟ ئایا ئەگەر لیٚی خۆش ببیٚ هیچ ترسیٚکی تیایە؟ ئیتر بە هیچ جۆریٚك ڕیٚی لیٚخۆش بوون

بەر نادا. ئەگەر شێرەکە وابزانێ کە من گوناهێکم هەیە من ئاگام لەوە نییە، بەڵام لە هەندێ بیرو باوەڕیدا ماوەم نەداوە لەبەر سوودی خۆی، وە ئامۆژگاریم کردووە، وەبەنهێنی کە کەس لەوێ نەبووبێ لەو بابەتەوە بەقسەی نەرم و جوان گفتوگۆم لەگەڵ کردووە، وە من زانیومە: ئەوەی بە قسەی برادەر نەکا لەکاتی ئیش دا، وە بەقسەی پزیشك نەکا لەکاتی نەخۆشیدا وەبەقسەی زانایان نەکا لەکاتی هەڵە دا، بەڕاستی بە هەڵەدا ئەچێ و زیاتر توشی سەختی ئەبێ. وەمن ئەترسم شێرەکە ئەمەی بەهەڵە زانیبێ کەمن ئامۆژگاریم کردووە، وە ئەگەر ئەوەش نەبێ ڕەنگە لە گەورەیی و مەستی پادشاییەوەبێ،چونکە هاوڕێیەتی ئەوان ترسناکە هەرچەندە کە خاوەنی پەیمان و سوێندو ئاشتی بن. وە ئەگەر ئەوەش نەبێ ڕەنگە لەبەر ئەوەبێ کەتۆزێك پایەو زانینم هەیە ئەیانەوێ لەناوم ببەن، وەئەگەر ئەمەش نەبێ کەواتە کاری ڕۆژگارە ناگەڕێتەوە. هەر ڕۆژگارە کەهێزو هەڵمەت لەشێر ئەسێنی وئەی خاتە گۆڕ. هەر ئەوە کە پیاوی داماو سواری پشتی فیلی بەهێز ئەکا. هەرئەوە کەیەکێك ئەنێرێ دانی ماری زەهراوی دەردێنێ و یاری پێ ئەکا. هەر ئەوە کەئازا ترسنۆك وەترسنۆك ئازائەکا، هەژار دەوڵەمەند و خانەدان ریسوائەکا، لە کاتی هاتنی ئەو هۆیانەی کە ڕۆژگار بۆی داناون. (دیمنە) ووتی: ئەوەی کەشێر لەتۆی ئەوێ لەکەسەوەنییە، بەڵکولەخراپەو ناپاکی خۆیەتی، پیاو خراپ و زۆردارە. خۆراکی ئەوشیرینە، بەڵام ژێرەکەی زەهرە.

(شەترەبە) ووتی: ئەوە نییە منیش لەو شیرینی یەم خواردوو وازم نەهێنا هەتاگەیشتمە دواییەکەی کەمردنە، ئەگەر ڕۆژم تەواو نەبوایە

منی پوش خۆر نە ئەهاتمە لای ئەم شێرە گۆشت خۆرە. لێرەدا من وەك هەنگێکم لیٚ هات کە بەسەر گوڵە[1] (نیلۆ فەڕ) دەوە ئەنیشێتەوە وەهەر بۆن و تامی ئەچێژیٚ هەتا شەودێت و گوڵەکە دێتەوە یەك و لەناویا ئەمریٚ. وەئەوەی کەلە جیهاندا چاو برسی بیٚ بەهیچ شتێك تێر ناخوا، وەك ئەومێشە وایە کە بەدارو درەختەوە ناوەستیٚ و ئەڕواتە سەر گوێی فیل، ئەویش لیٚی ئەداو ئەی کوژیٚ، وە ئەوەی کە چاکەو ئامۆژگاری کەسێك بکا کەچاکەو سوپاسی لانەبیٚ. وەك تۆو لە بیابانێکی سوێراوکدا بچێنیٚ وایە. وە ئەوەی کە پرس بە پیاوی لە خۆبایی بکا وەك قسە لەگەڵ مردوو بکا یا مژدە بەکەڕ بدا وایە.

(دیمنە) ووتی: واز لەم قسانە بێنەو چارەیەك بۆ خۆت بدۆزەرەوە. (شەترەبە)ووتی: چارەی چی بدۆزمەوە کەشێر وەك تۆ ئەڵیٚی ئەیەویٚ بمخوا. بزانە ئەگەر ئەوهەرچاکەی منی بویٚ بەڵام هاورێکانی بیانەویٚ کە بەدرۆو ناپاکی لە ناوم ببەن ئەتوانن، چونکە هەر کاتیٚ پیاو خراپ و فێڵباز کۆبوونەوە بۆ لەناو بردنی کەسێکی ڕاست هەرچەندە کە بەهێز بیٚ. وەئەوان بیٚ دەستەڵاتیش بن ئەتوانن کە لەناوی ببەن. وەك گورگ وقەلە ڕەشکەو چەقەڵ کە کۆبوونەوە و بەدرۆو دەلەسە وناپاکی ووشترەکەیان لەناو برد.

(دیمنە) ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ (شەترەبە) وتی: ئەگێڕنەوە: شێرێك لەدارستانی نزیك ڕێگایەکەوە ئەژیا، وە سیٚ هاورێی ئەبیٚ، گورگ و قەلە ڕەشکەو چەقەڵ. چەند شوانێك لەو ڕێگایەوە ئەڕۆن ووشترێکیان لیٚ بەجیٚ ئەمێنیٚ. ووشترەکە ملئەنیٚ هەتا ئەچێتە

---

[1] نیلۆ فەڕ =گوڵێکی بۆن خۆشە

بەردەمی شێرەکە، ئەویش ئەڵێ لە کوێوە هاتووی؟ ووشترەکە ووتی: لە بیابانەوە. شێرەکە ووتی: ئیشت چییە؟ ووتی: هەرکارێك کەپادشا بیەوێ. شێرەکە ووتی: لێرەبە لای من وەبەخۆشی و کامەرانی بژی. ووشترەکە ماوەیەکی زۆر لەگەڵ شێرەکەدا بوو. شێرەکە ڕۆژێك چوو بۆڕاو تووشی فیلێکی گەورە بوو، شەڕێکی گەورەی لەگەڵ کرد وەهەموو لەشی بریندار بوو، فیلەکە بەکەڵبەکانی برینداری کردبوو. کە هاتەوە لانەکەی، خۆی لێدا بەزەویدا، ئیتر نەیتوانی ڕاوبکا. گورگ و قەلە ڕەشکەو چەقەڵیش چەند ڕۆژێك بەبرسی مانەوە، چونکە لە پاشماوەی شێرەکە خواردنیان ئەخوارد، تووشی لاوازی ببوون و شێرەکەش پێی زانین و پیێ ی ووتن: بەبێ خۆراك لاواز بوون؟ ووتیان ئێمە خەمی تۆ ئەخۆین ئەی پادشا، خۆزگە خواردنێکی وامان دەست بکەوتایە کەبەکەڵکی تۆ بهاتایە. شێرکە ووتی: من لێتان ناشارمەوە کەبرسیمە، بەڵام بگەڕێن بەڵکو شتێك پەیدا بکەین کە بیخۆین هەرسێکیان کە چوونە دەرەوەو لە کەنارێکدا کۆ بوونەوە و ووتیان: ئەم پوش خۆرە بەکاری چی دێ، بۆچی شێرەکە والێنەکەین کەبی خواو ئێمەش تێر گۆشت بکا؟

چەقەڵەکە ووتی: ئەوە ناکرێ، چونکە ئەو ووشترەکەی دڵنیاکردووە وپەیمانی ئاشتی داوەتێ.

قەلە ڕەشەکە ووتی: ئیشی شێر لەسەر من. فڕی و هاتەوە لای شێر ئەویش ووتی: هیچتان ڕاونەکرد؟ ووتی: ئەی پادشا کەسێك ڕاو ئەکا کەبتوانێ بگەڕێ و چاوی باش ببینێ.

ئێمە لەبرسانا هیچمان بۆناکرێ. بەڵام چارەیەکمان دۆزیوەتەوە ئەگەر پادشا ئارەزووبکا ئامادەین بۆکردنی. شێرەکە ووتی: ئەو چارەیە چییە؟ قەلەڕەشەکە ووتی: خواردنی ئەم وشترە گیاخۆرە کە بێ ئیش و بێ کار لەناو ئێمەدا ئەسوڕێتەوە. کەشێرەکە ئەوەی بیست ڕقی هەستاو ووتی: قسەکەت چەندناشرینە وەچەند دڵڕەق و خراپی. چۆن ئەوێری بەمجۆرە قسەم لەگەڵدا بکەی کەخۆت ئەزانی سوێندم بۆ خواردووەو پەیمانی ئاشتیم داوەتێ. بۆچی نازانی هیچ کەسێك پاداشتی چاکە وەرناگرێ وەك ئەوەی کەکەسێکی ترساوی لێ قەوماو دڵخۆش ئەکا وەخوێنێکی لەدەست دەرچوو ئەشارێتەوە؟ من دڵنیامکردووە ناپاکی لەگەڵدا نەکەم. قەلە ڕەشەکە ووتی: ئەزانم کە پادشای گەورە چی ئەفەرموێ، بەڵام گیانی تاقەکەسێك قوربانییە بۆ خێزانێك، وە خێزان بۆ هۆزو هۆز بۆشار، وە دانیشتوانی شار ئەبن بەقوربانی لەبەرخاتری پادشا. ئێستا پادشا پێویستی یەکی هەیە. من چارەیەکی بۆ ئەدۆزمەوە لەبەرسوێندو پەیمانەکەی هەروەکو ئەو ئاگای لەوکارە نەبێ وەپرسیار لەکەس نەکا، شێرەکە بێ دەنگ بوو. قەلە ڕەشەکە زانی کە شێر ئەمەی بەدڵەو فڕی و هاتەوە بۆلای ئەوان و پێی ووتن: قسەم لەگەڵ شێردا کردووە، ئەبێ هەمووومان لای ئەو کۆببینەوە کەوشترەکەش لەوێبێ، وە باسی ئازاری پادشا بکەین، وە هەریەکە خۆی پێشکەش بکا کەبیخوا، وەدوانەکەی ترمان قسەکەی بەدرۆ بخەینەوە بەوەی کەگۆشتی پیسەو بەکاری پادشا نایە. ئەگەر ئەوەمان کرد سەرئەکەوین و پادشاش پێی خۆشە.

لەپاشا لای شێرەکە کۆبوونەوە. قەلە ڕەشەکە بەشێرەکەی ووت ئەی پادشا تۆبرسیتەو لەسەرئێمە پێویستە کەخۆمانت پێشکەش بکەین

چونکه خوا نەخواستە ئەگەر تۆ شتێکت بەسەر هات ئێمەش لەناو ئەچین ئەوا خۆم پێشکەش کردی کەبم خۆی.

گورگەکەو چەقەڵەکە وەڵامیان دایەوە: گۆشتت پیسە کەی پادشا سوود لە تۆ وەرئەگرێ؟

چەقەڵەکە ووتی: من پادشا تێرئەکەم بابمخوا ئەواخۆمم بۆکرد بە قوربانی.

گورگ و قەلە ڕەشەکە ووتیان: تۆبەکاری خواردنی پادشانایەی لەڕولاوازو بێ کەڵکی. لەپاشا گورگەکە ووتی: من ئەتوانم پادشاتێرکەم لەڕو لاواز نیم.

قەلەڕەشکەوچەقەڵ ووتیان: ووسبە تۆگۆشتت تاڵە پزیشکەکان ووتوویانە: ئەوەی کە بیەوێ خۆی لەناوببا باگۆشتی گورگ بخوا ووشترەکەش وایزانی ئەگەر ئەویش خۆی پێشکەشی پادشابکا هاوڕێکانی نایەڵن و چارەیەکیش بۆئەو ئەدۆزنەوەو بەم کارەش شێر لە خۆی ڕازی ئەکا. لەبەر ئەوە ووتی: بەڵام من پادشا تێر ئەکەم گۆشتم خاوێن و ناوسکم پاکە باپادشا بمخواو هاوڕێ و نۆکەرانیشی لێ تێر بکا. گورگ و قەلە ڕەشکەو چەقەڵ بەیەك دەنگ ووتیان ووشتر ڕاست ئەکاو پیاوەتی خۆیەتی دەستبەجێ پەلاماریان دایەو پارچە پارچەیان کرد. لەبەر ئەوە ئەم پەندەم بۆ ووتی کەبزانی ئەگەر هاوڕێیانی شێر لەسەر لەناوبردنی من کۆبوونەتەوە من ناتوانم کە خۆم بپارێزم هەر چەندە ئەگەر شێر لەگەڵ ئەواندا نەبێ وەچاکەی منی بوێ پێشینان ووتوویانە: چاکترینی پادشا ئەوەیە کە بتوانێ یەکسانی بخاتە نێوان ئادەمیزادەوە. هەرچەندە ئەگەر پادشا چاکەی منی بوێ قسەی زۆری

ئەمو ئەو لای ئەدەن و بەزەیی لە دڵدا نامێنێ. ئاو کەزۆر بەسەر بەردا ڕژا هەر مایەوە ئەبینین کە کاری لێ ئەکا و کونی تێئەکا. خۆبەرد لە ئادەمیزاد بەهێزترە، وە قسەش لە ئاو بەکارترە، ئیتر چۆن قسەی زۆر کار لەو ناکا؟

(دیمنە) ووتی: ئێستا ئەتەوێ چی بکەی؟

(شەترەبە) ووتی: شەڕ کردن نەبێ هیچ بەباش نازانم، چونکە نوێژ کەرو چاکە کەرو مەلای مزگەوت پاداشتی چاکە وەرناگرن وەك کەسێك کە لەڕێی ڕزگاری خۆی و سەربەرزیدا کوشتاربکا بەمەرجێك کە لەسەر مافی خۆی بێ.

(دیمنە) ووتی: ڕاست نییە کەیەکێك خۆی بخاتە گێژاوی کوشتارەوە کە جگە لەوە بتوانێ فێڵی تر بکا. بەڵام پیاوی ژیر لە دوای هەموو شتێك کە چارەی نەما شەڕئەکا. زاناکان ووتوویانە: هەرگیز دوژمنی هەژاری داماوت بەلاوەی سوك نەبێ، بەتایبەتی فێڵاوییەك کە بتوانێ هاوڕێ و برادەر ڕابکێشی، نەخوازە ئەم شێرە بەهێزە نەترسە، هەر وەکوو ووتوویانە: ئەوەی دوژمنی بێدەستەڵات بەسووك تەماشابکات ئەوەی بەسەردادێ کە بەسەر خێوی دەریاداهات بە دەستی (زیقاوڵەوە). (شەترەبە) ووتی: ئەوە چۆن بووە؟

دیمنە ووتی:

ئەگێڕنەوە باڵندەیەك کە پێیان ئەوت (زیقاوڵە) لە قەراغ دەریایەکدا هێلانەیەك ئەکا، ژنەکەی پێی ئەڵێ خۆزگە شوێنێکی ترمان بدۆزیایەتەوە، چونکە لێرەدا ئەترسم کە ئاو هەستا (خێوی دەریا) بێت وبەچکەکانمان ببات، چونکە گەلێ جار هەڕەشەی لێکردووین. ئەویش ووتی: لە شوێنی خۆتا هێلکە بکە هیچ مەترسە (خێوی دەریا) ئیشی

وا ناکا. مێیەکە هەر چەندە قسەی بۆ کرد سوودی نەبوو. لەپاشا پێی ووت: ئەوەی کە قسەی چاك وەرنەگرێ ئەوەی بەسەردادێ کە بەسەر کیسەڵەکەدا هات گوێی نەدایە قسەی مراوییەکان.

(زیقاوڵە) نێرەکە ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ (مێیەکە) ووتی:

ئەگێڕنەوە گۆمێك هەبوو کیسەڵێکی تێدا ئەژیا وەلەنزیك گۆمەکەوە دو مراوی ئەژیان، ئەمانە لەگەڵ کیسەڵەکە دۆستایەتییان پەیداکردوو هۆگری یەکتر بوون، لەپاشان ئاوی گۆمەکە دێتە کزی و وشکبوون، مراوییەکان دێن کەماڵئاوایی لە کیسەڵەکە بکەن وەئەڵێن: ئێمە لەبەر ووشکبوونی ئەم گۆمە ئەڕۆین بۆ شوێنێکی تر. کیسەڵەکە ئەڵێ: بەخوا ووشکبوونی ئاوی ئەم گۆمەبەمنەوە دیارە. وەکوکەشتی وام، بەئاونەبێ ناژیم. ئەبێ منیش لەگەڵ خۆتانا بەرن.

ووتیان: دارێك دێنین بەدەنووك هەردووسەری ئەگرین تۆش ناوەڕاستی دارەکە توند بەدەم بگرە لەپاشان بەئاسماندا ئەدبەین، بەڵام ئەگەر گوێت لەقسەی ئەم و ئەو بوو نابێ بەهیچ جۆرێك قسە بکەی، وە قسەی زاناکان بێنەرەوەبیرت کەووتوویانە: هەرچی بەسەر پیاودا بێ لە جیهاندا بەهۆی زمانەوەیە. لەپاشان هەڵیان گرت و بەهەوادا فڕین. دانیشتوانی ئەوناوچەیە کە ئەوەیان دی ووتیان: چەند سەیرە ئەو دومراوییە کیسەڵێکیان هەڵگرتووە، کیسەڵەکە خۆی پێ ڕانەگیراو ووتی: یاخواکوێربن. لەگەڵ قسەکردنا کەوتە خوارەوە ومرد!

زیقاوڵە بەژنەکەی ووت: قسەکەتم بیست، بەڵام لە (خێوی دەریا) مەترسە. لەپاش ماوەیەك ئاوی دەریا هەستاو خێوی دەریاش بەچکەکانی بردن. مێیەکە ووتی: من زووئەمزانی ئەم کارەساتە

ئەقەومێ. نێرەکە ووتی: تۆڵە ئەسێنم. هەستاو چووە لای کۆمەڵێك باڵندەو سکاڵای خۆی کرد ئەوانیش ووتیان: (مل درێژ) پادشامانە بمانبەبۆلای هەتابانگی بکەین وهاواری بۆببەین کەبەهێزی سەربازەکانی تۆڵە بستێنێ. بەکۆمەڵ چوون بۆلای و هاواریان بۆ برد ئەویش خۆی دەرخست، وەتێیان گەیاندو داوای یارمەتییان لێکرد. ئەویش بڕیاریدا کە تۆڵەی بسێنێ. خێوی دەریا کە ئەوەی زانی ترسا لەشەڕی پادشایەك کەهێزی بەسەریا نییە لەبەر ئەوە خێرا بەچکەکانی زیقاوڵەی هێنایەوە، لەپاشا ڕێککەوتن، پادشای باڵندەش وازی لێ هێنا.

لەبەر ئەوە ئەم قسانەم بۆ کردی کەبزانی شەڕکردنی تۆ لەگەڵ شێردا باش نییە (شەترەبە) ووتی: من شەڕوو دوژمنایەتی لەگەڵ ئەودا ناکەم هەتا بەتەواوی بۆم ڕوون نەبێتەوە، ئەوکاتە بەفێڵ زاڵ ئەبم بەسەریا. (دیمنە) ئەوەی پێ ناخۆش بوو، وە زانی ئەگەر شێرەکە ئەو شتانەی لەگاکەدا نەیدی کەئەو وتبووی دڵ لەم پیس ئەکا وەبەدرۆزن دەر ئەچێ. لەبەر ئەوە ووتی: هەستە بڕۆ بۆلای شێر کەسەیری کردی ئەزانی چی لەژێر سەردایە (شەترەبە) ووتی: چۆن ئەزانم؟ دیمنە ووتی: ئەی بینی کەخۆی ئامادەکردووە سنگی دەرپەڕاندووە، لەسەر کلك دانیشتووە و گوێی قووت کردووە و بە توندی سەیرت ئەکاو دەمیشی داپچڕیوە. شەترەبە ووتی: ئەگەر بەو جۆرە دیم تێئەگەم کە قسەکانت هەمووی ڕاستن و هیچ درۆی تیانییە.

کە دیمنە لێ بووەوە لە هاندانی (شێرو گا) لە یەکتر، ئینجا هات بۆ لای کەلیلەی برای، هەردووکیان بەیەکەوە چوون بۆ سەیری شەڕی (شێرو گا).

(شەترەبە) کەگەیشتە لای شێرەکەو سەیری کرد کە هەر وەکو دیمنە ووتبووی چەمۆڵەی دادابوو وەئامادەبوو پێی ووت: هاوڕێی پادشا وەك هاوڕێی مار وایە کەنازانێ کەی پێوەی ئەدا. شێرەکەش کە سەیری گاکەی کرد ئەونیشانانەی هاتە پێش چاو کە دیمنە پێی ووتبوو، وای زانی کە بۆشەڕ هاتووە، پەلا ماریدایەو شەڕیان گەرم بوو وەخوێن ڕژا.

کاتێ (کەلیلە) ئەوەی دی بە دیمنەی ووت: هەی ناپیاو شێر بریندار بوو، گاکەش لەناو چوو. خراپترینی کارئەوەیە کەپیاو هاوڕێکەی توشی شەڕبکا وەلەوەزیاتر چارەیەك نەزانێ. پیاوی ژیر بەووردی سەیری کار ئەکاوبیری لێئەکاتەوە، ئەگەر زانی باشەو ترسی تیانییە لێی ئەچێتە پێشەوە، بەڵام ئەگەر زانی خراپ وترسناکە وازی لێ دێنی. من لەم گوناهە گەورەیەت ئەترسم، تۆ قسەی جوانت کرد، بەڵام کردارت جوان نەبوو، کوا پەیمانەکەت کەزیان بەشێر نەگەیەنی؟ زاناکان ووتوویانە: قسە لەگەڵ ئیش دا، وە زانین لەگەڵ خۆپاراستن دا، وە چاکە کردن لەگەڵ هیوادا، وەماڵ لەگەڵ بەخشندەییدا، وەژیان لەگەڵ لەش ساغی دا، وەسەر بەستی لەگەڵ شادی دا بەکاردێ.

تۆبزانە کەئامۆژگاری پیاوی ژیر لەلاساری دوور ئەخاتەوە کەچی گەوج لاسارتر ئەکا. وە کو رۆژ کەچاوی هەموو چاوساغێك تیژتر ئەکا، کەچی (شەمشەمە کوێرە) کوێرتر ئەکا. پێشینان ووتوویانە: هەرچەندە کە پادشا پیاوێکی گەورەو دادپەرست بێ، بەڵام وەزیرەکانی خراپ و دڵرەقبن، نایەڵن چاکە بەکەس بگەیەنێ، وە کەس ناوێرێ لێی نزیك بێتەوە، وە وەکو ئاوێکی پاكوجوان وایە کەتمساحی تیابێ کەس ناوێرێ ئاوی لێبخواتەوە. تۆش ئەی دیمنە ئەتەوێ کەخۆت نەبێ

کەسی تر لەشێر نزیك نەبێتەوە، ئەمەیش کارێکەو کەهەرگیز ناکرێ و ناشبێ، چونکە ووتوویانە:

دەریا بەشەپۆلدانیو پاشا بە هاوڕێیانی. ئەوەش گەوجییە هاوڕێ پەیدا کردن بەبێ پەیمان، وەکڕینی بەهەشت بەپاکانەوە سودی خۆ بەزیانی لەکەسانی تر. بەلاَم ئامۆژگارییەکانی من بۆ تۆ وەك قسەی ئەو پیاوەی لێ هات کەبەباڵندەکەی ووت: ئەوکەسە ڕاست مەکەرەوە کەڕاست ناکرێتەوە، وە ئامۆژگاری کەسێك مەکە کەقسە وەر ناگرێ.

(دیمنە) ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ (کەلیلە) ووتی:

ئەگێڕنەوە کۆمەڵێك مەیمون شەوێکی ساردی زستان لە ئەشکەوتێکدا ویستیان ئاگر بکەنەوە، چاویان کەوت بە(گوڵە ئەستێرەیەك)[1] کەبەهەوادا ئەفڕی وەك پریشکی ئاگر وابوو. گرتیان لەپاشا دارێکی زۆریان کۆکردەوەو گوڵە ئەستێرەیان خستە سەرو دەستیان کرد بەفوو کردن. لەنزیکیانەوە باڵندەیەك هەبوو بانگی کردن ووتی: ئەوەی کە گرتووتانە ئاگر نییە، بەلاَم گوێیان بەقسەکەی نەدا. ویستی کەبچێ تێیان بگەیەنێ پیاوێك کەلەوێوە ئەڕۆی پێی ووت: کەسێك ڕاست مەکەرەوە کەڕاست ناکرێتەوە. ئەوبەردە ڕەقەی کە هەرگیز ناشکێ شمشێری لەسەر تاقی ناکرێتەوە وەئەو دارەی کەناچەمێ گۆچانو کەوانی لێ درووست ناکرێ. خۆت ماندوو مەکە. باڵندەکە گوێی نەدایە. چووبۆلایان کەتێیان بگەیەنێ کە ئەوەی گرتویانە ئاگرنی یە (گوڵە ئەستێرەیە).

یەکێك لە مەیمونەکان گرتی و دای بەزەویداو کوشتی.

---

[1] گوڵە ئەستێرە جۆرە مێشێکە کەبەشەو ئەفڕێ وەك پریشکی ئاگر وایە.

ئەمەش ئامۆژگاری یەکانی من بوو لەگەڵ تۆدا. لەپاشا فێری فێڵ و تاوانیش بووی، وەفێڵ ئەنجامی لەتاوان خراپترە بۆئەمەش سەرگوزشتەیەك هەیە.

(دیمنە) ووتی: ئەوسەر گوزشتەیە چۆن بووە؟

(کەلیلە)ووتی: ئەگێرنەوە دوپیاوی (فێڵباز) و (بێ هۆش) ئەڕۆن بۆ بازرگانی. لەڕێ (کابرای بێ هوش) تۆزێك دووائەکەوێ کیسەیەك ئەدۆزێتەوە کەهەزاردیناری تیائەبێ.دائەنیشن بۆبەشکردنی. فێڵبازەکە لە دڵی خۆیدا بڕیارئەدا کەهەزاردینارەکەی لێ بسێنێ. ووتی: بەشی ناکەین چونکە هاوبەشی و ڕێکەوتن دڵپاکی و تێکەڵی پێوەیە. بەلام هەریەکەمان شتێکی لێهەڵئەگرین، وە ئەوەکەی تری لەژێرئەم دارەدا ئەشارینەوە، هەرکاتێ ویستمان دێینەوە پارەی لێ هەڵئەگرین. پارەکەیان لەژێر دارێکی زۆر گەورەدا شاردەوەو هاتنەوە بۆشار لەپاشان کابرای فێڵباز بەدزییەوە ئەچێت هەمووی ئەبا، وە شوێنەکەی وەکو جاران چاك ئەکاتەوە. لەپاش چەند مانگێك کابرای (بێ هۆش) دێت و ئەڵێ بەخوابرادەر من هەژارم پێویستیم بەپارە هەیە بابچین بۆلای دارەکە. بەیەکەوە ئەچن سەیر ئەکەن هیچی تیانەماوە. فێڵباز بەهەردوو چەپۆك ئەماڵێ بەسەری خۆیاوئەڵێ: پیاو هەرگیزلە هاوڕێی دڵپاك نەبێ، بەدزی منەوە هاتووی پارەکەت بردووە. ئەویش سوێندی بۆ ئەخوا کەبەهیچ جۆرێك ئاگای لەوە نییە (کابرای فێڵباز ئەڵێ: تۆنەبی کەسی تر بەم شوێنە نازانێ. لێیان ئەبێ بەشەڕوو ئەچنە لای قازی و کابرای فێڵباز لەوێ ئەڵێ: ئەم کابرایە هەزار دینارەکەی بردووە. بێ هۆشیش ئەڵێ: درۆئەکا.

قازی بەفێڵبازەکە ئەڵێ: شایەتت هەیە کەئەم بردوویەتی؟ ئەڵێ: بەڵێ دارەکە شایەتیم بۆئەدا کە ئەم بردوویەتی، کابرای فێڵباز بەرلەوە باوکی ئەخاتە ناو کلۆری دارەکەوە کەخۆی بشارێتەوە کە رسیاریان کرد وەڵام بداتەوە.

کە قازی ئەوەی بیست سەری سوڕماو هەستا خۆی و سەربازوو فێڵبازوو بێ هۆش هەموو چوون بۆلای دارەکە. قازی پرسیاری لە دارەکەکرد کابرای پیرە لەناوەوە ووتی: بەڵێ بێ هۆش پارەکەی (بردووە).

کە قازی ئەوەی گوێ لێ بوو زۆرسەری سوڕما. فەرمانیدا کە دارەکە بسووتێنن، لە هەموولایەکەوە ئاگریان تێ بەردا، باوکی فێڵباز دەستی کرد بە هاوارکردن کەدەریان هێنا نزیك بوو بخنكێ قازی پرسیاری لێ کرد ئەویش بەڕاستی پێی ووت:

قازی زللەیەکی لێداو کابرای فێڵبازیان دارکاری کردوو پشتاوپشت سواریان کردوو گێڕایان، وە قازی هەموو پارەکەی لێ سەندەوەودای بە بێ هۆش، لەبەر ئەوە ئەم قسەیەم بۆکردی کە بزانی فێڵ باز هەمیشە لە ژێرەوەدیە. تۆش فێڵ و تاوان سەریان تێکردووی، ئەوەش بزانە کە لە سزا ڕزگارت نابێ، چونکە دووزمان و دوڕوویت. ئاوی ڕووبار ئەوەندە خۆشە کەنەگاتە دەریا. وەخۆشی خێزان ئەوەندەیە کەپیاو خراپیان تیانییە. پیاوی دوزمان وەك مار وایە کەپیاو پەروەردەی ئەکا. لەپاشا هیچی لێ نابینێ پێوەدانەبێ. پێشینان ووتوویانە لەگەڵ پیاوی ژیرو بەخشندەدا بگەڕێ چونکە تەواوەو کەمو کوڕی تیانییە. وەلەگەڵ پیاوی ژیرو بەرچاوتەنگیشدا بگەڕێ هەرچەندە کەڕەوشتی باش نیە، بەڵام خۆت لەڕەوشتی بپارێزە و کەڵك لەمێشکی وەربگرە. هەروەها

هاوڕێیەتی بگرە لەگەڵ پیاوی بەخشندەی گەوج دا. کەڵك لە بەخشندەییەکەی وەربگرە، وەبەژیری خۆت سوودی پێ بگەیەنە. بەلام لەدەستی بەرچاوتەنگی گەوج ڕابکەو خۆت دووربخەرەوە. منیش خۆم لەتۆ دوور بخەمەوە باشە. هاوڕێ چۆن کەڵك لەتۆ وەرئەگرێ کەتۆ ئەوەت کرد بەپادشاکەت کەڕێزی ئەگرتی وسەربەرزی کردبووی. ئەمە وەك سەرگوزشتەی ئەو بازرگانە وایە کەووتی: خاکێك مشکەکانی سەد مەن ئاسن بخۆن، دورنییە کەبازەکانی فیل هەڵ بگرن (دیمنە) ووتی: ئەوە چۆن بووە؟

(کەلیلە) ووتی: ئەگێڕنەوە بازرگانێك هەبوو چوو بۆبازرگانی کردن لەدەرەوە، سەد مەن ئاسنی هەبوو دایەدەست یەکێك لەهاوڕێکانی. کەهاتەوە داوای ئاسنەکەی کرد، کابراووتی:مشك خواردی. بازرگانەکە ووتی: بیستوومە کەهیچ شتێك نیە وەك مشك بتوانێ ئاسن بخوا. کابرا ئەمەی پێی خۆش بوو کە باوەڕی پێکرد، بازرگانەکە کەهاتە دەرەوە و چاوی کەوت بەمناڵێکی کابرا لەگەڵ خۆیدا بردییەوە بۆ ماڵەوە. بەیانی کابرا هات و پێی ووت: نازانی کوڕەکەی من لە کوێیە؟ بازرگانەکە پێی ووت: دوێنێ کە لەماڵی ئێوە هاتمەدەرەوە، چاوم کەوت بەبازێك مناڵێکی هەڵگرتبوو وابزانم کوڕەکەی تۆبوو. کابرا کێشای بەسەری خۆیداو ووتی: ئەی برادەران هەرگیز بیستوتانە باز مناڵ هەڵ بگرێ؟

بازرگانەکە ووتی: بەڵێ: خاکێك مشکەکانی سەدمەن ئاسن بخۆن هیچ دورنییە کە بازەکانی فیل هەڵ بگرن.

کابرا پێی ووت: ئاسنەکەتم خواردووە، ئەمەش نرخەکەیەتی کوڕەکەم بدەرەوە.

لەبەر ئەوە ئەم قسەیەم بۆکردی کەبزانی ئەگەر ناپاکی لەگەڵ هاوڕێتا بکەی لەگەڵ کەسانی تردا زیاتر ئەیکەی. وەئەوەی کە هاورێیەکی هەبوو وەخراپەی دەربارەی کەسانی ترکرد هاوڕێکەی تێئەگا کەمانای دۆستایەتی نازانێ:

هیچ شتێك وەك دۆستایەتی لەناو نەچووە کەلەگەڵ یەکێکدا بکرێ کە پەیمانی لانەبێ، وە چاکە لەگەڵ کەسێکدا کە سوپاسی نەکا، وە ئامۆژگاری بۆکەسێك کەقسەوەرنەگرێ، وەنهێنی لای کەسێك کەپارێزگاری نەکا، هاوڕێی چاك چاکەی لەدوایە. وە دۆستی خراپ خراپە ئەدا، وەك با ئەگەر بەلای بۆنی خۆشدا بڕوا هەڵی ئەگرێ، وەئەگەر بەلای شتی بۆگەن دا بڕوا هەر هەڵی ئەگرێ. ئیتر قسەی من لەگەڵ تۆدا زۆرگران بوو. (کەلیلە) لەقسەکانی بووەوە شێرەکەش گاکەی کوشت، لەپاش کوشتنی تووڕەییەکەی نەماو ووتی: داخەکەم زۆر ژیرو دانابوو، نازانم لەوانەیە کەبێ گوناه بووبێ، یان درۆیان بەدەمەوە کردبێ. ئیتر زۆر پەشیمان بووەو خەفەتی خوارد. (دیمنە) بەوجۆرە شێرەکەی دی هات بۆلایو ووتی: مژدەبێ خوا دوژمنەکەی لەناو بردی بۆچی خەفەت ئەخۆی ئەی پادشا؟ شێرەکە ووتی: من بۆ ژیری و ڕۆشنبیریو ڕەوشتی باشی (شەترەبە) خەفەت ئەخۆم. (دیمنە) ووتی: هیچ بەزەییت پیادا نەیەتەوە ئەی پادشا: پیاوی ژیر بەزەیی بەکەسێکدا نایەتەوە کەلێی بترسێ وەپیاوی لەسەر خۆ و تێگەیشتوو ڕەنگە کەسێك لە خۆی نزیك بکاتەوە لەبەر سوودی خۆی هەر چەندە کە ڕقیشی لێی بێ. وەك ئەوەی کە دەرمانی تاڵ بەنابەدڵ ئەخواتەوە لەبەر چاکبوون لەدەردوو نە خۆشی، وەکەسێکی زۆر گەورەو خۆشەویستی دووربخاتەوە و لەناوی بەرێ لەترسی گیانی خۆی، وەك ئەوەی کەمار

بەپەنجەیەوە ئەدا ئەی قرتێنێ لەبەر ئەوەی کە ژەهرەکەی نەچێتە ناو لەشییەوە. شێرەکە بەقسەی (دیمنە)ی کرد. وەلەپاشا پێی زانی کە درۆزن و ناپاکە ئینجا کوشتی و لەناوی برد.

******

(دەرگای شێرو گا)

تەواو بوو

# دەرگای پشکنینی کاری (دیمنە)

(دبشەلیم) پاشادی هیند ووتی: بە (بەیدەبای) ی فیلەسوف:

باسی دوزمانی فێڵبازم بیست کە ناکۆکی ئەخاتە ناو هاوڕێیانەوە، ئێستا باسی دیمنەم بۆبکە لەپاش کوشتنی گاکە چی بەسەردا هات؟ وەکە شێرەکە بەناپاکی ئەوی زانی، وەڵامی چی بوو؟ وە چۆن ئەی ویست کەخۆی لە سزا ڕزگار بکات؟

فەیلەسوفەکە ووتی: کاتێ کە شێرەکە گاکەی کوشت لەپاشا پەشیمان بۆوە، وەبیری لەهاوڕێیەتی وپیاوەتی و زانینی ئەو ئەکردەوە.

وە هاوڕێی خۆشەویستی شێرەکە لەپاش گاکە (پڵنگ) بوو. شەوێك لای شێرەکە دانیشتبوو، کەدرەنگ بوو هەستا و ڕۆیشتەوە بۆماڵەوە. لەڕێ بەلای ماڵی کەلیلەو دیمنەدا تێپەڕی، گوێی لێ بوو (کەلیلە) سەر زەنشتی (دیمنە)ی ئەکرد. ئەویش بێدەنگ ڕاوەستاو گوێی لێ گرتن. (کەلیلە) ئەی ووت بە(دیمنە) گوناهێکی گەورەت کرد، ئەگەر شێر بەو کارەت بزانێ کە بەفێڵ و ناپاکی و دوزمانی کردت لەناوئەچیو کەس یارمەتیت نادا، وە سوك و ڕیسوا ئەبیت، منیش لەمڕۆ بەدواوە هاوڕێیەتیت ناکەم، چونکە زاناکان ووتوویانە: لەو کەسە دووربە کەحەز لەچارەی ناکەی. منیش چاکتر وایە کەخۆمت لێ دوور بخەمەوە هەتا منیش بەهۆی ناپاکی تۆوە تووشی سزاو خراپە

نەبم. کە پڵنگەکە ئەوەی بیست دەستبەجێ گەڕایەوەو چووبۆڵای دایکی شێرەکە، وەئەو قسانەی هەموو بۆ گێڕایەوە، وەسوێندیدا کە ئەم نهێنییە لای کەس ئاشکرانەکا.

کە ڕۆژ بووەوە دایکی شێرەکە چووبۆڵای کوڕەکەی‌و لێی پرسی: ئەوە بۆچی خەفەت ئەخۆی؟ ووتی: لەبەر کوشتنی گاکە وامن زویرم کە هەرگیز هاوڕێی وام نەبووە.

دایکی ووتی: گەورەترینی شایەت ئەوەیە کەپیاو خۆی پێ لە گوناهی خۆی بنێ. ئەمە گوناهێکی گەورەیە، چۆن لەخۆتەوە گاکەت کوشت بەبێ ئەوەی کەهیچ لەبابەت ئەوەوە بزانی؟ ئەگەر لەبەر قسەی زاناکان نەبوایە کەئاشکرا کردنی نهێنیان بەلاوە چەندخراپە، ئێستە هەرچی ئەزانم پێم ئەووتی، شێرەکە وتی: قسەی زاناکان گەلێ جۆرن بەڵام مەبەستیان جیاوازە، وە من ئەزانم کەقسەکەت ڕاستە، ئەگەر شتێك ئەزانی لەم بابەتەوە لێمی مەشارەوە. بەکورتی دایکی شێرەکە هەرچی پڵنگەکە پێی ووتبوو هەمووی بۆ گێڕایەوە، بەڵام ناوی پڵنگەکەی نەبرد. لەپاشا ووتی: قسەی زاناکانم لەبیر نەچووەتەوە کە سزای گەورەیان داناوە بۆئەوکەسەی کە نهێنی ئاشکرا ئەکات، بەڵام بۆیە پێم ووتی کەئیترکەس خراپەو ناپاکی بەرامبەر پادشا نەکات، وە تەمێ خواربێن. شێرەکە فەرمانیدا بەکۆبوونەوە، لەپاشا ناردی (دیمنە)یان هێناو لەبەردەم شێردا ڕایانگرت. (دیمنە) ووتی:

چی ڕووی داوە؟ بۆچی پادشا خەفەتبارە؟ دایکی شێرەکە ووتی: مانەوەی تۆ ئەوی زویر کردووە ئەگەر بۆماوەی ساتێك بێ، وە لەم ڕۆ بەدواوە بەزیندوویی ناتهێڵێ. (دیمنە)ووتی: بەرکەوتوو هیچی

نەهێشتووەتەوە بۆ دواکەوتوو، چونکە ئەڵێن ئەوەی کە لەهەموو کەس زیاترخۆی لەخراپە ئەپارێزێ لەپێش ئەوەدا تووشی ئەبێ کە خۆی داوە بەدەستی یەوە. باپادشاو سەربازانی نمونەیەکی خراپ نەبن وەکو بیستومە ئەڵێن:

ئەوەی پیاو خراپ بناسێ و هاوڕێیەتییان بکات گوناهی بەملی خۆیەتی، هەر لەبەر ئەوەیە کە خواپەرستان خۆیان لە کەسانی تر دوور ئەخەنەوە و بەتەنها ڕائەبوێرن وەخۆشەویستی خوایان هەڵبژاردووە بەسەر شادی و خۆشی جیهاندا. کێ پاداشی چاکە ئەداتەوەبەچاکە خوای گەورە نەبێ؟ ئەوەی بەهیوای چاکەی ئادەمیزادبێ و وازلەخوای گەورەبهێنێ گۆڕی ئەوەیە کە هیچی دەست نەکەوێ، چونکە بەهەڵەدائەچێ کەئیش لەبەر خواناکا وەهیوای چاکەی بەدەستی ئادەمیزاد هەیە. وەلەسەر سەربازو هاوڕێی پادشا پێویستە کەئیش لەشوێنی خۆیدا بکەن. زاناکان ووتوویانە:

ئەوەی قسەی ڕاست لەشوێنی درۆدا، وەدرۆ لەشوێنی ڕاستدا بکات لە ڕیزی تێگەیشتواندا نییە. لەبەر ئەوە پێویستە کەپادشا لەم کارەی مندا پەلە نەکا، وە من لەترسی مردن ئەم قسەیە ناکەم، چونکە هەر چەند بترسم هەرئەمرم وەهەموو زیندوویەك ئەمرێ و لەناو ئەچێ. ئەگەر سەدگیانم هەبێ، وە بزانم بەمردنم پادشا شادئەبێ خۆمی لەڕێدا بەخت ئەکەم بەهەر سەدیانەوە. یەکێك لەسەر بازەکان ووتی: لەبەرپادشا ئەمەی نەووت، بەڵکو لەترسی گیانی خۆی بوو. (دیمنە) گوێی لێ بوو پێی ووت: بۆچی ئەمە خراپە؟ کەس هەیە بەپیاو نزیکتر لەخۆی؟ پیاو ئەگەر لەخۆی نەترسێ ئەی لەکێ ئەترسێ؟ وادیارە تۆ

زۆر خراپ و دڵ ڕەقی، وەچاکەی کەست ناوێ، وە دوژمنی گیانی خۆتی، تۆ بەکاری ئەوە نایەی کەسەربازی پادشابی.

کە(دیمنە)ئەوقسانەی پێووت: شەرمەزاربوو وەچووە دەرەوە (دایکی شێرەکە) بە (دیمنە) ی ووت: سەرم لەتۆ سورماوە کەچەندە ناپاک و بێ شەرمی. چەند زوو وەڵامی ئەوە ئەدەیتەوە کە قسەت لەگەڵدا ئەکا هەی فێڵ باز (دیمنە) ووتی: ئاخر تۆ بەیەك چاو سەیری من ئەکەی وە بەیەك گوێ گوێم لێ ڕائەگری، لەگەڵ ئەوەدا کە بەدبەختی ڕووی تێکردووم کە دەرگاوانەکانی پادشا بەدرۆو دەلەسە باسی منیان لای پادشا کردووە. دایکی شێرەکە ووتی: سەیری ئەم تاوان کارە، واخۆی نیشان ئەدا کە هیچ گوناهێکی نییە، (دیمنە) ووتی: ئەوانەی کەکارێك ئەکەن کەبەئیشی ئەوان ناشێ، باریان نییە وەك ئەوپیاوەی کەجلی ژنان ئەکاتە بەر وەئەوژنەی جلی پیاوانە لەبەر ئەکا. وەئەوەی کەخۆڵ ئەکاتە شوێنی پەین، وە ئەو میوانەی کەخۆی بەخاوەن ماڵ ئەزانێ، وەئەوەی کەپرسیاری لێ ناکرێ و لەخۆیەوە قسە ئەکا. تاونبار ئەو کەسەیە کەئیشی خۆی و کەسی تر نازانێ، وەناتوانێ تاوان و خراپە لەخۆی دوور بخاتەوە. دایکی شێرەکە ووتی: وا ئەزانی بەم قسانەت پادشا هەڵ ئەخەڵەتێ هەی زۆردار؟ (دیمنە)ووتی: زۆردار ئەوکەسەیە کە دوژمنی ناناسێ و بەبێ گوناه ئەی کوژێ. دایکی شێرەکە ووتی: وائەزانی کەلەئەنجامی دووزمانی ڕزگارت ئەبێ هەی درۆزن؟ (دیمنە) ووتی: درۆزن ئەوەیە کە قسەی وائەکا کە نەبووە. وە کاری وائەکا کە هەرگیز نەکراوە ونابێ، بەڵام من قسەکانم ڕونو ئاشکران، دایکی شێرەکە ووتی: زاناکان لەئێوەن کەبەڕاستی ئەم کارە ڕوون ئەکەنەوە،

لەپاشا هەستاو چووە دەرەوە شێرەکە دیمنەی دایە دەست قازی، ئەویش فەرمانیدا پەتێکیان خستە ناو ملی و بردیان بۆ بەندیخانە.

لە نیوە شەودا (کەلیلە)ی برای بەدزییەوە هاتەلای لە بەندیخانەکەدا، وەدەستی کرد بەگریان و ووتی: بەهۆی درۆزنی و فێڵبازییەوە نەبوایە نەئەهاتیتە ئێرە. بەڵام هیچ چارەم نییە لەبەر ئەوەی کەزوو ئامۆژگاری برایانەم کردی، بەڵام یاخی بوویت.

بزانە کەهەر شوێنێك قسەی خۆی، وەهەر جێیەك ڕێیەکی هەیە، ئەگەر لەکاتی خۆشیتا ئامۆژگاریم نەکردیتایە ئێستا منیش لەگەڵ تۆدا لێرەدا ئەبووم. بەڵام تۆخۆتت لیَ بایی ببوو بەجۆرێك کەهۆشت لای خۆت نەمابوو. من هەمیشە قسەی زاناکانم بیر ئەخستیتەوە کە ووتوویانە: (فێڵباز لەپێش کاتی مردنیدا لەناو ئەچیَ).

(دیمنە) ووتی: ڕاست ئەکەی، بەڵام زاناکان ووتوویانە: پیاو لەسەر گوناه لەجیهاندا سزا بدریَ چەکترە لەوەی کەلەدواییدا بەئاگری دۆزەخ[1] سزای بدەن. (کەلیلە) ووتی: ڕاست ئەکەی، بەڵام گوناهەکەت گەورەیە،وەسزای شێرەکەش سەختە. لەنزیك ئەوانەوە لەبەندیخانەکەدا (وێزێکی[2])پێوەندکراو هەبوو، وەئەمان چاویان لەو نەبوو، گوێی لەقسەکانیان ڕاگرتبوو. بەتەواوی قسەکانیانی ڕەوانکرد بۆئەوەی کەپرسیاری لێکرا شایەتی پێوە بدا.

کەڕۆژبووەوە دایکی شێرەکە چوو بۆلای کوڕەکەی، وە پێی ووت: ئەی گەورەی گیانەوەر ئەوەی کەدوێنیَ لەکاتی خۆیدا کردت خوای گەورەت پیَ ڕازی کرد. زاناکان ووتوویانە: پێویستە پیاو هەرگیز

(1) دۆزەخ = جەهەنەم

(2) وێز = فهد، ناوی دڕندەیەکە

سستی نەکا لەکردنی چاکە، وەگوناهی پیاوخراپ نەپۆشیٚ و یارمەتی نەدا.

کەشێرەکە ئەوەی بیست فەرمانیدا بەپڵنگەکە کە سەرۆکی دادپەروەران بوو کەلەگەڵ (شێری داد پەروەر)دا دابنیشیٚ کەمامی شێرەکەبوو. وە سەربازەکان ووردو بچوك بانگ بکەنە بارەگا، وە بەووردی سەیری کاری (دیمنە)بکەن وە بۆ گوناهەکەی بگەڕێن وە قسەو گفتوگۆی دیمنەش بنوسن، وەڕۆژ بەڕۆژ بۆی ڕەوانە بکەن. لەپاشا هەردووکیان لەگەڵ قازیدا لە(بارەگای دادپەرستی)دا دانیشتن، وەبانگی هەموو سەربازەکانیان کردوو کۆبوونەوە. لەپاش سیٚ سەعات گفتوگۆ قازی فەرمانیدا کە (دیمنە) بێنن. دیمنەیان هێنا لەبەردەم قازیدا ڕایان وەستاند. سەرگەورەی کۆمەڵەکە هەستاو بانگی کرد: ئەی دانیشتوان خۆتان ئەزانن کەپادشای گەورە لەوڕۆژەوە کە(شەترەبە) کوژراوە هێزی لەبەر براوە، چونکە واتێئەگا کەئەوەی بەدوزمانی و درۆی (دیمنە) کوشتووە. وە ئەم قازییە فەرمانی پیٚ دراوە کەکاری دیمنە ڕوون بکاتەوە، ئێستاش هەرکەسێك لەئێوە شتێك ئەزانیٚ لەم بابەتەوە قسە بکا بۆئەوەی کەبەپێی ئەوە یاساو [1] فەرمانی بۆدابنریٚ. ئەگەر ماڧ کوشتنی هەبیٚ نابیٚ پەلەبکەین، چونکە پەلە پەشیمانی لە دوایە، وەشوێنی هاوڕیٚ کەوتن لەسەر درۆ سووکی یە.

لەدوای ئەو قازی هەستاو ووتی: ئەی دانیشتوان گویٚ لە قسەی سەرۆکتان بگرن، وە هەرچی ئەزانن مەی شارنەوە لەبەر سیٚ شت:

یەکەم: چونکە گوناهی (دیمنە) گەورەیە. زاناکان ووتوویانە: گەورەترینی گوناه کوشتنی بێتاوانە بەدرۆو دوزمانی وەئەوەی کە شتێك بزانیٚ و بۆی بپۆشیٚ هاوبەشی ئەوە لەو گوناهەدا.

---

[1] یاسا = قانوون

دووەم: ئەگەر گوناهبار خۆی پیێ بنێ لە گوناهەکەی چاکترە بۆئەو وە نزیکترە کە پادشاو هاورێیانی لیێی خۆش بن.

سێیەم: خۆ دوورخستنەوە لەپیاو خراپ و گوناهبار پێویستە لەسەر هەموو کەسێکی تێ گەیشتوو. ئەوەی لەکاری ئەم فێڵبازە شتێك بزانێ باقسەبکا هەتا ببێتە بەڵگەیەك لەسەری. چونکە زاناکان ووتوویانە ئەوەی کە شایەتی مردوویەك بشارێتەوە، لە ڕۆژی زیندوو بوونەوەدا بە ئاگری دۆزەخ لغاوی ئەکەن.

کاتێ کە کۆمەڵەکە ئەوەیان بیست بێ دەنگ بوون. (دیمنە) ووتی: بۆچی دەنگ ناکەن؟ چی ئەزانن بیڵێن هەر قسەیەك وەڵامی خۆی هەیە، زاناکان ووتوویانە: ئەوەی کەشایەتی شتێك لەخۆیەوەبدات کەبەچاو نەی دیوە، وەشتێك بڵێ کەنای زانێ، ئەوەی بەسەردا دێ کەبەسەر پزیشکەکەدا هات. کۆمەڵەکە ووتیان: ئەوە چۆن بووە؟ دیمنە ووتی:

ئەگێڕنەوە لەشارێکدا پزیشکێکی شارەزاهەبوو کەزۆر کەم نەخۆشی لەدەستی دەرئەچوو. لەپاشا پیربوو، وەچاوی کزبوو،پادشای ئەو شارە کچێکی هەبوو کەژنی برازایەکی خۆی بوو. کچەکە سکی هاتە ئازار، پزیشکەکەیان بۆهێنا، ئەویش دەردودەرمانی زانی، بەڵام ووتی: داخەکەم ئەگەر چاوم بیبینیایە دەرمانم بۆئەگرتەوە، وەلەمەدا باوەڕم بەکەسی ترنییە کەبتوانێ ئەم کارە بکا. لەوشارەدا کابرایەکی گەوج هەبوو، کەئەوەی بیست هات بۆلای پادشا ووتی: من لەپزیشکی و گرتنەوەو ناسینی دەرماندا زۆر شارەزام، پادشا فەرمانیدا کە بچێتە دەرمانگەکەیەوە، وە دەرمانەکە بگرێتەوە، لە خۆیەوە دەستی کرد بە دەرمان گرتنەوە. شووشەیەك زەهری تێکەڵکرد بەبێ ئەوەی کە بزانێ چییە، لەو دەرمانەی دا بەکچەکە خواردییەوە دەست بەجێ گیانی دەر چوو پادشاش کابرای گەوجی گرتوو لەو دەرمانەی دایە ئەویش مرد.

لەبەر ئەوە ئەم ئامۆژگارییەم بۆ ووتن کە بزانن گەلێ جار پیاولەڕێی ڕاست لا ئەداو بەهەڵەدا ئەچێ، ئەوکاتە ئێوەش وەك ئەو گەوجەتان بەسەردا دێ کە خۆی بەخۆی کرد. زاناکان ووتوویانە:

لەوانەیە کەقسەکەر پاداشی قسەی وەر بگرێ. وەقسەکردن بەدەست خۆتانە، بەڵام ئاگاتان لەخۆتان بێت، لەوکاتەدا(سەرداری بەرازەکان) کەبەشوێنی خۆی لای شێر ئەنازی ووتی: ئەی تێگەیشتوان گوێ لەمن بگرن، زاناکان ووتوویانە: پیاوچاك بە ڕەنگوڕوودا ئەناسرێ، ئێوەش بەهۆی چاکەی زۆری خوای گەورەو خۆشی و کامەرانییەوە پیاوی باش بەنیشانەدا ئەناسن، وەشتی گەورە بەهۆی بچوکەوە ئەزانن، لێرەدا گەلێ شت هەیە کەنیشانەن لەسەر ئەم نەگبەتە کەتاوان و خراپەی ئاشکرا ئەکات. قازی پێی ووت: وادیارە کەتۆ لەنیشانە و ڕەنگوڕوودا زانای. وەکاروبار بەوە ڕوون ئەکەیتەوە، ئێستە ئەوەی کەلەبابەت (دیمنە)وە ئەیزانی بۆمانی ڕوونبکەرەوە.

(سەرداری بەرازەکان)ووتی:زاناکان ووتویانە: ئەوەی کەچاوی چەپی لەڕاستی بچووکتربێ، ئەو چاوەی هەر هەڵ ئەفرێ. وەئەگەر لووتی بەلای ڕاستیدا خوار بوبێتەوە نەگبەت و پیسە. (دیمنە) پێی ووت: زۆر سەیری هەی پیسی بەدخوو، بەڵام ئەو کاتە سەیرتری کە لەگەڵ پادشادا ئەوەستی و پەلاماری خۆراکی ئەدەی بەو لەشە گەڕەتەوە، لەبەر هاوڕێیەتی باسم نەئەکردی، بەڵا م کەتۆ قسەت بەمن ووت: منیش تۆزێك باسی تۆ ئەکەم. تۆمافی ئەوەت نییە کەنانی پادشا بخۆی. چاکتر وایە هیچ کارێك نەکەی، وە نەبیتە جوتیارو سەر تاش و بۆیاخچی بۆرە پیاوێك نەخوازە کەیارمەتی دەری تایبەتی پادشابی.

(سەرداری بەرازەکان) ووتی: ئەوە بەمن ئەڵێی؟ (دیمنە) ووتی: بەڵێ بەتۆ ئەڵێم هەی قاچ خوارەی وورگ زلەی لێو قلیشاوەی ئێسك قورسە. (سەرداری بەرازەکان) سەری داخست و ڕەنگی تێك چوو،

زمانی بەسترا، وە لە شەرما دەستی کرد بەگریان (دیمنە) پێی ووت: پێویستە کە گریانت هەر درێژە بکێشێ، ئەو کاتەی کە پادشا بزانێ چەندپیسی ئیتر لە خۆراك وکاروبار دەرت ئەکا، لەو کۆمەڵەداچەقەڵێك هەبوو کە باوەڕپێکراوی پادشابوو، وە لەخۆی نزیك کردبووەوە، وە فەرمانی پێدابوو کەهەرچی ئەکەن بەدزییەوە ئاگاداری بکا. ئەوچەقەڵە چو بۆلای شێرەکە وەئەوقسانەی هەموو بۆگێڕایەوە شێرەکە فەرمانی دەرکرد بۆ لابردنی (سەرداری بەرازەکان) لە ئیشەکەی، وە جارێکی تر نەیەتەلای، وە چاوی پێی نەکەوێ.

وە فەرمانیدا کە(دیمنە) پێوەند بکەن و بیخەنە بەندیخانە، ڕۆژ زۆری نەمابوو هەرچی ئەوان و دیمنە ووتیان و کردیان نوسرایەوە و بەمۆری پڵنگەکە مۆریانکرد، وە هەریەکە ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵی خۆیان.

لەپاشا چەقەڵێك کەناوی(بەهرۆز)بوو دۆستی(کەلیلە)و خۆشەویستی شێرەکە بوو. هات بۆلای دیمنە و ئاگاداری کرد کە(کەلیلە) لە ترسی خۆی‌و خەفەتی براکەی مرد (دیمنە) گریاو ووتی: ئیتر من جیهانم بۆچییە؟ بەڵام سوپاس بۆخوای گەورە، (کەلیلە) نەمرد هەتا برایەکی وەك و تۆی دامێ برۆ بۆماڵی ئێمە هەرچی خوا داویەتی بیهێنە بۆئێرە. ئەویش چوو هەمووی هێنا. (دیمنە) نیوەی ئەو ماڵەی دایەو پێی ووت: تۆ لای پادشا دەستت ئەڕوا بزانە شێرەکە لەگەڵ دایکیدا چی ئەڵێن ئەو کاتە کەقازی قسەوباسی من‌و دوژمن ئەنێرێ بۆی. ئەویش بەڵێنی دایەو وەنیوەی ماڵەکەی بردبۆخۆی. بەیانی زوو شێرەکە لەبارەگای خۆیدا دانیشتبوو لەپاش دوو سەعات سەربازەکانی نوسراوەکەیان بۆ هێنا. ئەویش خوێندییەوە و دایکی ئاگادار کرد.دایکی هاواری کردو ووتی: بەلاتەوە گران نەبێت تۆدۆست و دوژمنت ناناسی. ئەم قسانەی کە لێرەدا نووسرابوو من نەم ووت کاری پێ مەکە، چونکە قسەی (دیمنە)ی زۆرداری ناپاکە. لەپاشا

بەتووڕەییییەوە هەستاو چووە دەرەوە (بەهرۆز) دوابەدوای ئەو چوو بۆلای (دیمنە) ئەوشتانەی بۆ گێڕایەوە. لەو کاتەدا دیمنەیان برد بۆلای قازی، قازی پێی ووت: ئەی(دیمنە) ڕاست بڕۆ ئیتر لەمە زیاتر پێویست نییە بەشوێن کاری تۆدا بگەڕێین.

زاناکان ووتوویانە:

خوا ئەم جیهانەی کردووە بە هۆیەکی ڕاستی پاش زیندووبوونەوە، چونکە خانەی پێغەمبەران و چاکانە، ئادەمیزاد ئەخەنە سەر ڕێی ڕاست و خواناسی کە لەپاشا بچنە بەهەشت. ئێستاش ئێمە لە کاری تۆ ئاگادارین، بەڵام پادشامان فەرمانی داوە کەجارێکی تریش سەیری بکەینەوە.

(دیمنە) ووتی: ئەی قازی تۆ دادپەروەر نیت. ئەمەش دوورە لەڕێی ڕاستەوە کەپادشایان بێ تاوان بدەنە دەست کەسی وەك تۆ. چۆن پەلە ئەکەی بۆ کوشتنی من لەبەر ئارەزووی خۆت، کەهێشتا سێ ڕۆژ بەسەرگرتنمدا تێ نەپەڕیوە! بەڵام بەخوا ئەوە ڕاستی ووتوە کە ئەڵێ: ئەوەی کە بەچاکە ڕاهاتبێ کردنی بەلایەوە ئاسانە هەرچەندە زیانیش بەخۆی بگەیەنێ.

قازی ووتی: ئێمە ئەزانین کە ئەبێ قازی لە کاری چاك و خراپ بزانێ هەتا بتوانێ پاداش و سزا بۆخاوەنەکانیان دابنێ، بەوجۆرە پیاو چاکان زیاترچاکە ئەکەن، وە پیاوخراپانیش لە خراپەکردن دوور ئەکەونەوە. ئیتر ئەڵێی چی ئەی(دیمنە) سەیری ئەم کارەساتە بکە کەتێی کەوتووی، وەپێ لەگوناهەکەت بنێ و بگەڕێوە بۆسەرڕێی ڕاست.

(دیمنە) وتی: قازی ڕاست ئەوەیە کە تەنها بەهەستکردن لەخۆیەوە کار ناکات، چونکە ئەمە هیچ دەرناخات. وەمن ئەزانم کە من پاکم، بەڵام ئێوە هەستی درۆ ئەکەن بەرامبەر بەمن، کەمن بەخۆڕایی کەسێکم دابێ بەکوشت. ئەی ئەگەر بمەوێت کەبەقسەی خۆم خۆم بەکوشت بدەم ئەبێ

چیم پێ بڵێن، کەئادەمیزاد خۆی لەهەمووشتێك بەلاوە گرنگترو خۆشەویست ترە؟ واز لەم قسانە بێنە ئەی قازی ئەگەر ئەمە ئامۆژگاری بێ بەهەڵەدا چووی، چونکە ئێرە شوێنی ئامۆژگاری نییە. وەئەگەر فێڵیش بێ بزانە کەپیاوی خۆی ناناسی، لەگەڵ ئەوە شدا فێڵ پیشەی هیچ کەسێکی لەخواترس و تێ گەیشتوو نییە. وەئەم قسانەی تۆ پیاو خراپ هەڵی ئەگرێ و کاری پێ ئەکا، چونکە کاروباری قازیەتی پیاوی چاك لەسەر ڕاستی ئەڕوا، بەڵام تاوانبار ڕێی چەوتی ئەگرێ و کاری پێ ئەکا. منیش ئەترسم ئەم قسانەی تۆ گەورەترین خراپەوتاوانی لێ بووەشێتەوە. تۆلای پادشاو سەربازان و هاوڕێیانی ئەو، وە هەموو کەسی تر بەگەورەو دادپەرست ناسراوی. ئەمەش هیچ گوناهێکی تیانییە، بەڵام گوناهی گەورە ئەوەیە کەبەرامبەر بەمن دادپەرست نەبووی. کەقازی ئەم قسانەی بیست هەمووی نووسیو بردی بۆشێرەکە ئەویش دایکی بانگ کرد بۆی خوێندەوە. دایکی ووتی: ئەترسم کەدیمنە بەفێڵ لەناوتببا یان پادشاییت لێ وەربگرێ، هەروەکو بەفێڵو دووزمانی هاوڕێکەتی پێ بەکوشت دای. ئەم قسەیەی دایکی کاری تێکرد، ووتی: باشە ئەوکەسەم پێ بڵێ کەشایەتی لە(دیمنە)ئەدالای تۆ هەتابیکەم بە بەڵگەیەك بۆکوشتنی. دایکی ووتی:حەزناکەم زاڵبم بەسەر (دیمنە)دا بەهۆی ئاشکراکردنی نهێنییەکەوە کەزاناکان ڕێی ئاشکراکردنیان نەداوە، بەڵام ئەو کەسەت بۆئەنێرم کەخۆی شایەتی لێ بدا.

لەپاشا ناردی بەدوای پڵنگەکەداو تێی گەیاند کەئەبێ یارمەتی شێر بدا لەسەر شتی ڕاست. وەئەو شایەتیە بدا کەپیاوی وەکو ئەونابێ بیشارێتەوە. جگە لەوەی کەلەسەری پێویستە لەیارمەتی دانی زۆر لێکراوان وەهەڵیژاردنی قسەی ڕاست لەژیان و مردندا، چونکە زاناکان ووتویانە: ئەوەی کە شایەتی مردووەیەك بشارێتەوە لەپاش زیندوو

بوونەوە تووشی هەڵەوسزای خۆی ئەبێ. بەم جۆرە وازی لێ نەهێنا هەتا ناردی بۆ لای شێرەکە، وە هەرچی بیستبوو لە بابەت دیمنەوە بۆی گێڕایەوە. کە پڵنگەکە شایەتی لەدیمنە دا،[1] (وێز)ە پێوەند کراوەکەش لە بەندیخانە کەدا کەقسەو گفتو گۆی دیمنەی بیستبوو ناردی ووتی: منیش شایەتییەکم بەلاوە هەیە. شێرەکە لە بەندیخانە دەری هێنا، وەشایەتی لەدیمنەدا کەلەبەندیخانەکەدا پێی لەگوناهەکەی نابوو.

شێرەکە پێی ووتن: بۆچی زووتر دەنگتان نەکرد کە ئەتانزانی ئێمە بۆکاری ئەوان ئەگەڕاین؟ هەردووکیان ووتیان: ئەمانزانی کە تەنها شایەتی یەك کەس لەدادگا بەکار نایەت، بەڵام کەیەکێکمان قسەی کرد ئەوی تریش شایەتی دا. شێرەکە قسەکەیانی پەسەند کرد. وە فەرمانی دا کە(دمینە) بکوژن. لە بەندیخانەکەدا بە سزایەکی قورس و ترسناك کوشتیان. ئەوەی کە سەیری ئەمە ئەکا بابزانێ کە ئەوەی بەفێڵ و زمانی لووس کەسانی تر تووشی خراپە بکا لەبەر قازانجی خۆی. ئەویش سزای ناپاکی خۆی وەر ئەگرێ.

*** ***

{دەرگای پشکنینی کاری (دیمنە)}

((تەواو بوو))

[1] وێز ـ فەهد ـ دڕندەیەکە

# دەرگـــای کۆترە ((ڕازاوە))



(دەبشەلیم) پادشای هیند ووتی بەبەیدەبای فەیلەسوف: پەندی درۆزنی فێڵبازم بیست کەناکۆکی ئەخاتە ناو هاوڕێیانەوەو چی بەسەردا دێ. ئێستا باسی برادەرانی چاك و خۆشەویستم بۆبکە کەچۆن یارمەتی یەك ئەدەن، وە هەموو تووشی چاکەو کامەرانی ئەبن.

فەیلەسووفەکە ووتی: پیاوی زانا هاوڕێ بەهیچ شتێك ناگۆڕێتەوە، چونکە برادەرانی چاك یارمەتی دەرن لەسەر هەموو چاکەو خۆشییەك، وە پیاو لە هەموو ناخۆشی و خراپەیەك ڕزگار ئەکەن. بۆ ئەمەش سەرگوزشتەیەك هەیە ئەویش سەر گوزشتەی کۆترە (ڕازاوە)، و (مشك) و (ئاسك) و (قەلە ڕەشکە) یە، پادشا ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ (بەیدەبا) ووتی: ئەگێڕنەوە لەخاکی (سەکاوەندە چین) لە نزیك شاری (داهەر) دارستانێك هەبوو کە ڕاوکەران ڕوویان تێ ئەکرد. لەوێدا دارێکی گەورە هەبوو کەهێلانەی قەلە ڕەشکەیەکی پێوە بوو. قەلەڕەشکەکە لە هێلانەکەیدابوو لە دوورەوە چاوی کەوت بەڕاوچییەکی پیسی ناشرین کە تۆڕێکی بەسەر شانیدا دابوو. ڕاوکەرەکە لەنزیك ئەودارەوە تۆڕەکەی نایەوەو هەندێ دانەوێڵەی کردەسەر. وەلە نزیکییەوە خۆی شاردەوە. زۆری پێ نەچوو کۆترێك هات ناوی (ڕازاوە) بوو، سەرداری کۆتران بوو، وە پۆلێك کۆتری لەگەڵدا بوو. چاویان لە ئاستی تۆڕەکە کوێر بوو. دەستیانکرد بەخواردنی دانەوێڵەکەی. هەموو کەوتنە ناو تۆڕەکەوە. ڕاوچییەکە بەدڵێکی خۆشەوە بەرەو ڕوویان ڕۆیشت (ڕازاوە) ووتی: یارمەتی یەکتر بدەن وە خۆتان لە یەکتر بە گەورەتر مەزانن، بەڵام ئادەی هەوڵ بدەین بائەم تۆڕە هەڵ بکەنین. ئەوکاتە خۆمان ڕزگار ئەکەین. کۆترەکان تۆڕەکەیان هەڵکەند، وە بەهەوادا بەرز بونەوە. بەڵام ڕاوچییەکە هەر هیوای لێ نەبڕین وەهەربەدوایاندا ڕۆیشت. قەلەڕەشکەش بەدویاندا ڕۆیشت کە بزانێ چی ئەکەن، وەچییان بەسەردا دێ؟ کۆترەکان بە تۆڕەکەوە بەرەو ئاوەدانی ڕۆیشتن وەخۆیان لە ڕاوچییەکە ونکرد. ئەویش هیوای لێ برین و گەڕایەوە. قەلەڕەشکە

هەر شوێنیان کەوت کە بزانیّ بۆ کویّ ئەچن. کۆتره (ڕازاوه) برادەرێکی مشکی هەبوو لەنزیك خانوەکەیەوه نیشتنەوه. مشکەکە ناوی (زیرەك) بوو وەسەد کونی هەبوو بۆکاتی ترس. کۆترەکە بانگی کرد ئەویش ووتی: تۆکیّ‌ی؟ ووتی: کۆتره ڕازاوەم. مشکەکە ووتی: ئەوه بۆچی کەوتویتە ئەم تۆڕەوە؟ ...

کۆترەکە ووتی: ئەمە کاری ڕۆژگاره کەلەمن بەهێزتریش پێوەند ئەکا. وه هەرچی قازانج و زیان هەیە بەدەست ئەوه، جاری واهەیە کە ڕۆژ و مانگیش ئەگیرێنیّ.

مشکەکە دەستی کرد بە قرتاندنی گریّ‌ی پەتی (ڕازاوه) ئەویش ووتی: لەپێشا گریّ‌ی کۆترەکان بقرتێنە من پەلەم نییە، مشکەکە گویّ‌ی نەدایە قسەکەی، (ڕازاوه) زۆر هەوڵیدا کە لەپێشا گرێی هاوڕێکانی بقرتێنیّ. مشکەکە ووتی: وا دیارە کە تۆ خۆتت بەلاوە هیچ نییە؟ ئەویش ووتی: ئەترسم ئەگەر گرێکانی من لەپێش ئەواندا بقرتێنی سستی بکەی لە ڕزگارکردنی ئەواندا، بەڵام من گویّ نادەمیّ هەر چۆنێك بێت نایەڵی من لە تۆڕەکەدا بمێنمەوه، مشکەکە ووتی:

ئەمە ئەوەندەی تر خۆشەویستی من‌وتۆ بەهێزترئەکا. مشکەکە تۆڕەکەی پارچە پارچە کرد وەهەمووویانی بەرەڵاکردوفڕین. کە قەلەڕەشکە ئەوەی چاو پیّ کەوت حەزی کرد ببیّ بە هاوڕێی مشکەکە وه بەناوی ئەوەوه بانگی کرد مشکەکە سەری دەرهێنا ووتی: ئەڵیّ‌ی چی؟ ووتی: ئەمەویّ کەببم بەهاوڕێت مشکەکە ووتی: من وتۆ بەیەکەوه ناگونجێین. پیاوی زانا کارێك ناکات کەڕیّ و جێی نەبێت. تۆ بخۆری و منیش خۆراکی تۆم، ئیتر چۆن ئەبێت من ببم بە هاوڕێت؟

قەلەڕەشەکە ووتی: من ڕەوشتی گەورەم لە تۆدا دیوە، هەرچەندە بیشاریتە هەردەرئەکەوێ. چونکە گەورەیی زانا وەك گوڵاوی ناوشوشە وایە کەبۆنی هەربڵاوئەبێتەوە. مشکەکە ووتی:گەورەترینی دوژمنایەتی دووجۆرن کە هەر لە بناغەوە درووست بوون. یەکەمیان وەك دوژمنایەتی شێرو فیل کە هێزیان بەرامبەرە. دورنیە کەشێر فیل بکوژێ یافیل شێر لەناو ببات. دووەمیان وەك دوژمنایەتی مشك و پشیلە کە هێزی یەکێکیان زاڵترە. ئەو دوژمنایەتیەی کە لەنێوانی من و تۆدا هەیە زیانی بۆ تۆ نییە، بەڵام زیانی بۆمنە. ئاو هەرچەندە گەرم بێت کە کرا بەسەر ئاگردا ئەیکوژێنێتەوە هاوڕێیەتی دوژمن وەك هەڵگرتنی مار وایە لە گیرفاندا، بەڵام پیاوی ژیر هەرگیز دۆستایەتی لەگەڵ دوژمنی زۆرزاندا نابەستێ.

قەلەڕەشکە ووتی: بەم قسانە ئیشەکە گران مەکە، چونکە دۆستایەتی کەسانی چاك زوو یەك ئەگرێ و درەنگ ئەپچڕێ، وەك گۆزەی ئاڵتون کەدرەنگ ئەشکێو زووچاك ئەکرێتەوە،بەڵام دۆستایەتی پیاو خراپ زوو ئەپچڕێ و درەنگ یەك ئەگرێتەوە وەك گۆزەی سواڵەت کە زوو دەشکێ و هەرگیز یەك ناگرێتەوە. پیاوی بەخشندە بەخشندەی خۆش ئەوێ، بەڵام چاوبرسی تەنها لەکاتی ئیش و ترسدانەبێ کەسی ناوێ، تۆبەخشندەی من دەرگات بەرنادەم وەتامی خواردن ناکەم هەتا نەمکەی بە برای خۆت. مشکەکە ووتی: من کەسم نائومێد نەکردووە، وەباوەڕێکی تەواوم بەخۆم هەیە ئیتر ئەگەر ناپاکیت لەگەڵدا کردم ناڵێی مشکان زوو دەستخەڕۆ ئەبن. وە ئادەمیزاد لە جیهاندا بۆلای دووکەس ئەچن: خاوەنی پارە یان ڕەوشت، خاوەن ڕەوشت لەناو

خۆیاندا ڕاستن. بەڵام پارەدار لەبەر قازانج یارمەتی یەکتر ئەدەن. ئەوەی کەچاکە بکات لەبەرقازانجی خۆی وەك ڕاوکەر وایە کەدانەوێڵە ئەڕێژێ بۆ باڵندە، کەلەبەر سوودی ئەوان ئەوە ناکا، بەڵام سوودی خۆی ئەوێ من بە جۆرێك پەیمانت لەگەڵدائەکەم کە هەردووکمان خاوەن ڕەوشت بین وەمن زیاتر لەبەرئەوەنایەم بۆلات، چونکە ئەزانم کە هاوڕێکانت وەك تۆن، بەڵام بەرامبەر بەمن بیرو باوەڕیان وەك تۆ نییە. قەلەڕەشەکە ووتی: نیشانەی هاوڕێی ڕاست ئەوەیە کەبۆدۆستی هاوڕێکەی دۆست، وە بۆدوژمنی ئەو دوژمن بێ. وە من نابم بەهاوڕێی ئەوانەی کە چاکەی تۆیان ناوێ.

لەپاشان مشکەکە هاتولەگەڵ قەلەڕەشەکەدا دەستی یەکتریان گووشی و بوون بە هاوڕێی خۆشەویستی یەکتر، ڕۆژێك قەلەڕەشکە پێی ووت: خانووەکەت لەئاوەدانییەوەنزیکە ئەترسم منداڵ بەرد بارانت بکەن. من لە شوێنێکی کەناردا هاوڕێیەکی کیسەڵم هەیە حەزئەکەم بچین و بەخۆشی ڕابوێرین شوێنێکی ئاودارو سەوزەگیاو پڕماسییە. مشکەکەووتی: کەگەیشتینەئەوێ چەندسەرگوزشتەیەکت بۆئەگێڕمەوە. لەپاشا قەلەڕەشکە کلکی مشکی گرت و بە هەوادا فڕی هەتا گەیشتنە ئەوکانییەی کە کیسەڵەکەی تیادا ئەژیا. قەلەڕشکە بانگی کردو ئەویش لەهێلانەی هاتە دەرەوەو ووتی: لەکوێ بووی؟ قەلەڕەشکەش لەوکاتەوە کە شوێنی کۆترەکان کەوت هەتا ئەوکاتەی گەیشتەلای ئەو هەموو بەسەرهاتی بۆ گێڕایەوە. کیسەڵەکە زۆر سەری لەچاکەو پیاوەتی مشکەکەسوڕما وەلێی پرسی: کەی هاتویتە ئەم وڵاتە؟ قەلەڕشکەش بە مشکەکەی ووت: ئەو سەرگوزشتانەی کە ووتت بۆتی ئەگێڕمەوە

ئێستا بیان گێڕەوە لەگەڵ وەڵامی پرسیارەکەی کیسەڵدا مشکەکە ووتی:

لەپێشامالم لەشاری(مارووت)بوو، لەخانووی پیاوێکی خواپەرستدا. ژن و منالی نەبوو، هەموو ڕۆژێك لەپاش نانخواردن ئەوەی لیی ئەمایەوە لە سەبەتەیەکدا هەلی ئەواسی. منیش دوای ئەو بەدزییەوە هەلئەگەڕام هەمووم ئەخوارد و ئەمکردە خواریَ بۆمشکەکانی تر. زۆر جار هەولی ئەدا کە لە شوێنێك سەبەتەکە دابنیَ کە دەستم نەی گاتیَ، بەلام سوودی نەبوو. هەتا شەوێك میوانێکی هات بەیەکەوە نانیان خوارد لەپاشا خوا پەرستەکە ووتی: لەکوێوە هاتووی و بۆ کویَ ئەچی؟ میوانەکە گەلیَ شوێن گەڕابوو وەشتی سەیری دی بوو. دەستی کرد بەگێڕانەوەیان خواپەرستەکەش چەپلەی لیَ ئەدا کەمن لە سەبەتەکە دوور بخاتەوە میوانەکە تووڕەبوو ووتی: من قسەت بۆ ئەکەم کەچی تۆ گالتەم پیَ ئەکەی. جابۆچی پرسیارت لیَ کردم؟ خوا پەرستەکە ووتی: لەبەر ئەوە چەپلە لیَ ئەدەم کە مشکێك دوور بخەمەوە کە سەرم لەکاری سوڕماوە هەرخۆراکێك دابنێم ئەیخوا، میوانەکە ووتی: تاقە یەك مشك ئەوە ئەکا؟ خوا پەرستەکە ووتی: مشکی مالەکە زۆرن،بەلام یەکێکیانە کەدەستەلاتم بەسەریدانییە.میوانەکە ووتی: قسەی ئەو کەسەت خستمەوەبیر کە ووتی: ئەم ئافرەتە لەبەر شتێك هەیە کە کونجی پاك کراو ئەفرۆشی بەپاك نەکراو.

خوا پەرستەکە پیی ووت: ئەوە چۆن بووە؟ میوانەکە ووتی: جارێك لە وولاتێك بووم بەمیوانی کابرایەك شەو گوێم لیَ بوو بەژنەکەی ووت، سبەینیَ میوانمان دیَ نان درووست بکە. ژنەکەی ووتی: تۆ پیاوێکی

هیچ شك نابەی  وە هیچ کۆناکەیتەوە میوانی چی بانگ ئەکەی؟  کابرا ووتی: ئەنجامی هەڵگرتن و کۆکردنەوە ڕەنگە وەك ئەنجامەکەی گورگەکە بێ؟ ژنەکە ووتی: ئەوە چۆن بووە؟  پیاوەکە ووتی:

ئەگێڕنەوە ڕاوچییەك ئەچێ بۆ ڕاو ئاسکێك ڕاو ئەکا. لەپاشا چاوی بە بەرازێك ئەکەوێ و تیرێکی تێئەگرێ و بریندارى ئەکا. بەرازەکە بەرەو ڕووی دێ و شفرەیەکی لێ ئەداو ئەیکوژێ. بەرازەکە خۆیشی ئەکەوێ و ئەمرێ.  لەپڕ گورگێك دێتە سەریان لە دڵی خۆیدا ئەڵێ: ئەم سێ لاکە بەشی زۆرم ئەکا، بەڵام جارێ سیرمەی ئەم تیرەئەکەم بەخۆراکی ئەمرۆم، کەدەمی برد سیرمەکەی پچڕاند سەری کەوانەکە پەڕیو دای بە گەردنی دا و مرد .

لەبەر ئەوە ئەم قسەیەم بۆ کردی کە بزانی کۆکردنەوە ئەنجامی باش نییە. ژنەکە ووتی: ڕاست ئەکەی بەشی حەوت کەس کونجی و برنجمان هەیە بەیانی نان دروست ئەکەم.

ژنەکە بەیانی چوو کونجییەکەی پاك کردەوە و لەبەر هەتاو داینا بۆ ووشك بوونەوە. سەگێك دەمی تێ خست،  ژنەکە ئیتر بێزی نەئەهات کە بیکا بەچێشت. کۆی کردەوەو بردی بۆ بازاڕ، لەوێ سەربەسەردای بە کونجی پاك نەکراو، منیش لەوێ ڕاوەستا بووم. کابرایەك ووتی: ئەمە لەبەر شتێکە ئەم ئافرەتە کونجی پاك کراو ئەگۆڕێتەوە بە پاك نەکراو. منیش ئەڵێم هەڵبەت هۆیەك هەیە کە ئەو مشکە کارێکت پێ ئەکات کە لە دەستی وەڕس بووی ئادەی پاچێکم بۆ بێنە با کونەکەی هەڵ بکەنمو چاری بکەم. خوا پەرستەکە پاچێکی بۆ هێنا. منیش لە کونێکی ترا گوێم لە قسەکانیان بوو. وە لەکونەکەمدا سەد لیرە هەبوو میوانەکە

کونەکەی هەڵدڕی هەتا پارەکەی دۆزیەوە، بە خواپەرستەکەی ووت مشکەکە بە هۆی ئەم پارەیەوە هێزی پەلاماردانی هەیەو شارەزایە.

ئیتر لەمەودووا پەکی ئەکەوێ. بەیانی لەگەڵ مشکەکانی هاوڕێمدا چووم بۆسەبەتەکە کە هەرچەندم کرد نەمتوانی بیگەمێ. مشکەکان ووتیان: ئەمە بەکاری هاوڕێیەتی نەماوە، بێ هێزو بێ کاربووە، ئیتر بەجێیان هێشتم و چوون بۆلای دوژمنانم وەدەستیان کرد بە دووزمانی. لەدڵی خۆمدا ووتم هاوڕێ‌وبراو یارمەتیدەرنییە بەماڵ نەبێ، ئەوەی پارەی نەبێ ئیشی بۆناکرێ،چونکە هەژاری پەکی ئەخا وەك ئەو ئاوەی کە لە دۆڵدا لە ارانی زستان ئەمێنێتەوە وەبۆهیچ شوێنێك ناڕوا هەتا زەوی ئەی مژێ. وەسەیرمکرد ئەوەی کە برای نەبێ کەسی نیە وە ئەوەی کە کوڕی نییە ناوی نییە وەئەوەی ماڵی نییە مێشکی نیە، جیهان و پاشەڕۆژی نیە، پیاو کە هەژار بوو خزم و برادەر ڕووی تێ ناکەن داری خوراوی ڕواو لە زەوی سوێراوگدا کە لە هەموو لایەکەوە ڕزیوە وەك پیاوی هەژاری بێ دەستەڵات وایە کەچاوی لەدەستی هەمووکەسێکە. وەهەژاری سەری هەموو بەڵایەکە کەپیاو فێری درۆزنی‌و ناپاکی‌و خراپە ئەکا. وە ئەوەی کە لەوەو پێش بە چاکی ئەزانێ ئێستە هەستی خراپەی لێ ئەکا وەئەگەر کەسێکی تریش خراپەیەك بکات بەوی تێ ئەگەن. وە هەمیشە ناوی دەوڵەمەند بەگەورە ئەبەن وە سەرزەنشتی هەژار ئەکەن. هەژار ئەگەر ئازابوو پێی ئەڵێن هەڵەشەو خوێرییە. ئەگەر بەخشندە بوو پێی ئەڵێن دەستبڵاوە بۆیە هەژارە. ئەگەر هێمن بوو ئەڵێن زەبوون و داماوە ئەگەر ڕێزی خۆگر بێ ئەڵێن گەوج و نەزانە. مردن باشترە لەوەی کە پیاو ڕائەکێشی بۆ

سوالّکردن بە تایبەتی سوالّی کەسانی ڕەزیل و بەرچاو تەنگ. پیاوی بەڕێز ئەگەر پێی بڵێن دەست بکا بەدەمی مارداو زەهر دەربێنێ و بیخوا ئەوەی بەلاوە ئاسانترە کەداوای شت لە ڕەزیل بکا.

من چاوم کەوت بەمیوانەکە کەپارەکەی هەڵگرت وەلەگەڵ خواپەرستەکەدا بەشی کرد. خوا پەرستەکە بەشەکەی خۆی خستە ژێر سەرینەکەی. بڕیارمدا کەشەو هەندێکی لێ بدزم، بەڵکو پایەم تۆزێ بەرزتربکاو هەندێك لەهاوڕێکانم بۆبگێڕێتەوە. کە خەوی لێ کەوت چوم بەلای سەرینەکەیەوە، میوانەکە ئاگاداربوو دارێکی مالّی بەسەرما ڕام کرد خۆم گەیاندەوە کونەکەم و ئازارێکی زۆرم پێ گەیشت. دووبارە هەستام و چوومەوە. سەیرم کرد میوانەکە هەر بەئاگایەو چاودێریم ئەکا، ئەمجارەش دارێکی پیاکێشام خوێن بە لەشمدا هاتەخوارێ بە تەپاوتل خۆم گەیاندەوە کونەکەم وەئاگام لەخۆم نەما. ئیتر لەو کاتەوە کەیادی ئەو ڕووداوە ئەکەمەوە ترسێك بەسەرمادێت، لەپاشان لەدڵی خۆمداووتم:سزاونەگبەتی لەجیهاندابەهۆی چڵێسی وچاوبرسێتیەوەیە. وەگەڕان بەشوێنی ژیانی ئاسوودە لە ژیاندا لە شوێنی دوورو دەریادا چاکترە لە دەست گرتنەوە. وە هیچ شتێك لە ڕازی بوون چاکترنییە، ئیتر لەمالّی خواپەرستەکە بارمکرد و چوومە دەشت، هاوڕێیەکی کۆترم هەبوو کەبەهۆی ئەوەوە هاوڕێم پەیداکرد لەپاشان ئەم قەلەڕەشکەیە باسی هاوڕێیەتی تۆی بۆ کردم حەزم کرد کەمنیش لەگەڵ ئەودا بێمەلات وە تەنیایم پێ ناخۆش بوو. چونکە هیچ شتێك لە جیهاندا ناگاتە خۆشەویستی نێوان برادەران. وەهیچ ناخۆشیەك بەئەندازەی دوورکەوتنەوەیان ناخۆش نییە. بەڕاستی زانیومە کە پێویست ناکات پیاو بگەڕێ و هەوڵی زیاتر بدات جگە لەپێویستی تەواوی کە خۆی پێ

ئەپارێزێ لەخۆراك و خواردنەوەو تەندروستی و ڕابواردنی تەواو. ئەگەر کەسێك خاوەنی هەموو دارایی جیهان بێت بەکاری هیچ نایەت تەنها ئەوەندە نەبێت کەپێویستی تەواوی خۆی پێ جێبەجێ ئەکا. ئیتر هاتین بۆلات، من برای تۆم و وەهیوام وایە کەمنیش لای تۆ بەو جۆرەبم.

کە مشکەکە قسەکەی تەواو کرد کیسەڵەکە زۆر بەجوانی وەڵامی دایەوەو ووتی: قسەکانت زۆر بەجێ بوون وەبزانە قسەی جوان بەکرداری جواننەبێ تەواو نابێ. نەخۆش ئەگەر دەرمانی دەردی خۆی بزانێ هەتا بەکاری نەیەنێ سوودی نییە. هەمیشە مێشکت بخەرەکار وەخەفەت مەخۆ بۆسامان. پیاوی پیاوانە بەبێ سامانیش هەر ڕێزی لێ ئەگیرێ وەك شێر هەرچەندە کەڕاکشابێ یان بەسترابێتەوە هەرسامی هەیە و ترسی لێ ئەکرێ، بەڵام پیاوی دەوڵەمەند کەپیاوەتی لێ نەیە بەسووکی سەیرئەکرێ باماڵیشی زۆربێ وەك سەگ کە ڕێزی لێ ناگیرێ هەرچەندە کە تەوقی ئاڵتونی لە ملدا بێ. وەخۆت بەبێکەس مەزانە.

پیاوی زانا بێکەس نییە،چونکە وەك شێروایە کەبچێتە هەرشرێنێك هەر هێزو هەڵمەتی خۆی هەیە. هەمیشە ڕاست برۆ کامەرانی ڕووت تێ ئەکا وەکو ئاو کەهەمیشە ڕوولەلێژی ئەکا. گەورەیی ڕووئەکاتە شارەزای نەبەز. بەڵام تەمەڵی دوودڵ هەرگیز بەهیچ نابێ. زاناکان ووتوویانە: سێ شت مانەوەیان زۆر کەمە: سێبەری هەور لەهاوین دا، وەهاوڕێیەتی تاوانبار، وەخانووی بێ بناغە. پیاوی ژیر هەرگیز بۆسامان خەفەت ناخوا، چونکە مێشکی سامانی ئەوە لەگەڵ کردەوەی چاکدا وەهەمیشە باوەڕی هەیە کەکەس ناتوانێ ئەو کردەوە باشانەی

لێ زەوت بکا یان ڕەخنە لەکاری ئەو بگرێ، وەکەسێکە کە نابێ ئەو ئاگاداری پاشە ڕۆژی خۆی نەبێ، چونکە مردن لەناکاودا نەبێ پەیدا نابێ، وەکاتێکی زانراوی نییە هەرچەندە کەتۆ خۆت لەم قسانەدا شارەزای بەهۆی زانینتەوە، بەڵام هەر پێویست بوو کە بیڵێم، چونکە تۆ برای ئێمەی وەئێمەش ئامۆژگاری خۆمانت پێ ڕائەگەیەنین. کە قەلەڕەشەکە ئەو قسانەی لە کیسەڵەکە بیست زۆری پێ خۆش بوو ووتی: منیش سوپاستان ئەکەم وەبزانن کەخۆشی لەجیهاندا بۆهاوڕێیانی چاك و خۆشەویستە کەپێویستی یەکتر جێبەجێ ئەکەن. پیاوی گەورە کە تووشی ناخۆشی بوو هەر گەورە ئەتوانێ ڕزگاری بکا، وەك فیل کە لە قوڕدا چەقی بە فیل نەبێ دەرناچێ.

لەوکاتەدا کەئەمقسانەیان ئەکرد ئاسکێك بەرەو ڕوویان هات. کیسەڵەکە ترساو خۆی کرد بە ئاوەکەدا. مشکەکە چوو بەکونێکدا. قەلەڕەشەکە فڕیە سەردارێك لەپاشا بەهەوادا بەرز بووەوە لەوناوەدا کەسی نەدی، ئیترئەوانیش هاتنە دەرەوە، کیسەلەکە بەئاسکەکەی ووت: کەلەوکاتەدا سەیری ئاوەکەی ئەکرد: ئەگەر تینوتە بخۆرەوەو مەترسە. لەپاشان ئاسکەکە دانیشت ئەوانیش زۆر ڕێزیان گرت. کیسەڵەکە پێی ووت: داوات لێ ئەکەین کە لەگەڵ ئێمەدا لێرە بمێنیتەوە و ببی بە هاوڕێمان. ئێمە لێرەدا هەرگیز ڕاوکەرمان نەدیوە. ئێرە لەوەڕگاو ئاوی زۆرە. ئیتر بوون بەهاوڕێ و هۆگری یەکتر. ڕۆژێك ئاسکەکە نەهاتەوە قەلەڕەشەکە بە ئاسماندا فڕی سەیەریکرد کەوا لەناو تۆڕی ڕاوکەرێکدایە، کیسەڵ و قەلەڕەشکە بەمشکەکەیان ووت: ئەم کارە بەتۆ ئەکرێ براکەت ڕزگار بکە. مشکەکەش هات بۆلای ئاسکەکەو پێی ووت: خۆتۆ یەکێك بووی لە تێگەیشتوان بۆچی

کەوتیتە ناو ئەم دەردو سزایەوە؟ ئاسکەکە ووتی: تێگەیشتوو لەگەڵ کاری ڕۆژگاردا هیچی پێ ناکرێ. لەم قسانەدابوون کیسەڵەکە هات بۆلایان و خۆی پێ ڕانەگیرابوو لەدووری ئەوان. مشکەکە تۆڕەکەی قرتاندو ئاسکەکەی ڕزگارکرد. لەپڕ ڕاوچییەکە پەیدابوو. ئاسکەکە بۆی دەرچوو. مشکەکەش خۆی کرد بەکونێکداو وە قەلەڕەشەکەش فڕی هەرکیسەڵەکە لەشوێنی خۆیدا مایەوە. ڕاوچییەکە لەتۆڕەکەی نزیك بووەوە کەسەیری کرد پچڕاوە کەسیشی لەو ناوەدا نەدی کیسەڵ نەبێ لەڕقاگرتی و بەستی یەوەو بەجێی هێشت. زۆری پێنەچووکۆ بونەوەو سەیریان کرد ڕاوکەرەکە کیسەڵەکەی بەندکردووە زۆریان پێ ناخۆش بوو. مشکەکە ووتی: لەکارەساتێك ڕزگارمان ئەبێ ئەکەوینە یەکێکی خراپترەوە. ئەوکەسە ڕاستی کردووە کەووتوویەتی: پیاو هەر بەرەو پێشکەوتن ئەڕوا هەتا ئەکەوێ، کەکەوت درێژە ئەدا بەکەوتن هەرچەندە بە شەقامێکی ڕێکو ڕاستدا بڕوا. من ترسم لە کیسەڵ پەیدا کردووە کە چاکترین هاوڕێیەگرتومە نەك لەبەر پاداشتوچاکە بەڵکو لەبەر ڕەوشتی بەرز کە ئەوەش لەدۆستایەتی باوك بۆ کوڕی خۆی چاکترە وەمردن نەبێ هیچ شتێك لەناوی نابا. داخەکەم بۆ ئەم لاشەی مرۆڤە کە شوێنی هەموو دەردوبەڵایەکە وەهەمیشە لەئاڵوگۆڕدایەولەسەربارێك ناوەستێ هەروەکو ئەستێرە کەهەڵهاتن و ئاوا بونی تاسەر بۆنییە. ئەوانەی ئاوا ئەبن هەڵدێنەوە وەهەڵهاتوەکانیش ئاوائەبن. لەپاشا هەڵ دێنەوە و ئاوا ئەبنەوە و بەبێ کۆتایی. وەکو ئازاری بریندار کە برینی ئەکولێتەوە، ئەوکەسەش برینی خوێناوییە بە ونبووونی هاوڕێیانی لەپاش کۆبونەوەیان ئاسکەکەو قەلەڕەشکەکە ووتیان: هەرچەندە بترسین وە

قسەكانی تۆش ڕەوان و جوانبن بەكاری كیسەڵ نایەن. هەروەكو پێشینان ووتوویانە: پیاو لەكاتی ناخۆشیدا، وە پیاوی ڕاست لەئیش‌و كارو وەرگرتن و هێنانەوەدا وەخزم و كوڕ لەكاتی گرانی و سەختیدا دەرئەكەوێ. هەروەها برادەران لەكاتی گیرو گرفتدا تاقی ئەكرێنەوە. مشكەكە بەئاسكەكەی ووت: من وای بەباش ئەزانم كە تۆ بڕۆی خۆت نیشانی ڕاوچییەكە بدەی وەك بریندار وەقەلەڕەشكەش بەسەر لاشەتەوە بنیشێتەوە هەروەكو گۆشت لە لاشەت بخوا منیش لە نزیك ئەوەوە چاودێری ئەكەم، بەڵكو دوربكەوێتەوەوبەشوێن تۆدا بێت، بەڵام كە لێت نزیك بووە لەسەرخۆ ڕاكەو بەجۆرێك كەوازت لێ نەهێنێ هەتادوری ئەخەیتەوە. لەپاشان بەڕاكردن وەرە بۆماڵەوە. ئاسك و قەلەڕەشكە ئەو كارەیان كرد وەڕاوچییان دوورخستەوە. مشكەكەش پەتی كیسەڵەكەی پارچەپارچەكرد وە لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە بۆماڵەوە.

ڕاوچییەكە بە ماندوویەتی و دەردی سەرییەكی زۆرەوە گەڕایەوە سەیریكرد تۆڕەكەی پچڕاوەو بەكارنەماوە بیری كردەوە زۆر سەری سوڕما لەكاری ئەو ئاسكەی كە وەكو شەل خۆی نیشان ئەدا وە ئەو قەلەی كە دەنوكی لێ ئەدا. ئیتر وای زانی كە شێت بووە. لەپاشان پەتە پچڕاوەكانی تۆڕەكەی یادكردەوە لەگەڵ ونبوونی كیسەڵەكەدا. ڕاوچییەكەلەوخاكە زۆرترساو لەدڵی خۆیدا ووتی: ئەمە خاكی شەیتان‌و جنۆكەیە یان جێگەی جادوگەرانە. خێرا گەڕایە دواوەو ئاوڕی لە هیچ نەدایەوەو هیچی نەویست. قەلەڕەشكەو ئاسك و مشك و كیسەڵ گەڕانەوە لە سێبەری باخەكەیاندا جارێكی تر كۆبونەوە، وەبەخۆشی و ئاشتی هەتا دوایی ژیانیان ڕایانبوارد. ئەگەر ئەم گیانەوەرانە لەگەڵ بێ هێزی و كەم دەسەڵاتیاندا بتوانن كەچەندجار خۆیان لەناخۆشی و

گیروگرفت بەهۆی خۆشەویستی و یەکگرتنەوە ڕزگار بکەن .مرۆڤ کەخاوەنی بیرو ژیری و تێ گەیشتنە، وە چاکەو خراپە ئەزانێ زیاتر یەکبگرێ و یارمەتی یەکتر بدا. ئەمە پەندی هاوڕێیانی ڕاست و خۆشەویستە کە خۆیان لە پێناوی هاوڕێیەتیدا لەناو ئەبەن.

*** ***

{دەرگایکۆتره رازاوه}

تەواو بوو

# دەرگـــــای

# ( کونە پە پو )و( قەلەڕەش )



(دەبەشلیم) پادشای هیند ووتی بە (بەیدەبا)ی فەیلەسوف باسی هاوڕێیانی ڕاستم بیست کە لە هەموو کاتێکدا یارمەتی یەکتر ئەدەن. ئێستا باسی کاری ئەو دوژمنەم بۆبکە کە کەپیاو نابێ بەقسەی دەست خەڕۆ ببێ هەرچەندەکەخۆی بەدۆست نیشانبدات. فەیلەسوفەکەووتی:

ئەوەی بەقسەی دووژمن هەڵبخەڵەتێ ئەوەی بەسەردادێت کەبەسەر (کونەپەپوو)دا هات بەدەستی قەلەڕەشکەوە.

پادشا ووتی ئەوەچۆن بووە؟

(بەیدەبا)ووتی: ئەگێڕنەوە لەشاخێکدا دارێکی زۆرگەورە هەبوو وە هێلانەی هەزار(قەلەڕەشکە)ی پێوەبوو. لەنزیك ئەودارەوە ئەشکەوتێك هەبوو کە هەزار(کونەپەپوو)ی تێدابوو، کونەپەپووەکان شەوێکیان پەلاماری قەلەڕەشکەیانداو زۆریان لێ کوشتن، وە ژمارەیەکی زۆریان لێ بەدیل گرتن. بەیانی قەلەڕەشکەکان لای پادشاکەیان کۆبوونەوە ووتیان: خۆت ئەزانی کە دوێنێ شەو - چیمان بەسەرداهات بەدەستی پادشای (کونەپەپوو)وەوە، چارە بدۆزەرەوە ئەی پادشا.

پادشای قەلە ڕەشکەکان پێنج وەزیری هەبوو کە بەبیرتیژی ناسرابوو وەلەکارو فەرماندا پرسی پێ ئەکردن. بە یەکەمیانی ووت: ئەڵێی چی لەم کارەدا؟ ووتی: ئەی پادشا زاناکان ووتوویانە: دوژمنی زۆردار ئەبێ لەدەستی ڕاکەی. وەزیری دووەم ووتی: منیش هەر ڕاکردن بەباش ئەزانم. پادشا ووتی: ئەم بیرەتان بەباش نازانم کە نیشتمان بەجێ بێڵین لەبەر تاقە کارەساتێك. من ئەڵێم چاکتر وایە خۆمان ئامادە بکەین و ئاگری شەڕدابگرسێنین وەخومان لە قەڵاو شورادا قایم بکەین جارێك بەهێمنی و جارێك بەچەك خۆمان لەدەستیان ڕزگار ئەکەین.

وەزیری سێیەم ووتی: چاکتر وایە کە چەند کەسێك بەجاسوسی بنێرین بزانین ئایا شەڕیان ئەوێ یان باج یان ڕێککەوتن؟ ئەگەر زانیمان بەماڵ وازمان لێ دێنن ئەوا هەموو ساڵێك باجیان ئەدەینێ، بەم جۆرە

خۆمان و نیشتمانمان ڕزگار ئەکەین. ڕەوشتی پادشایان هەر وابووە کە دوژمنیان بەدەسەلات و زۆردار بووبێ بەماڵ خۆیان و وولات و گەلیان پاراستووە.

وەزیری چوارەم ووتی: منیش بیرم وایە کەوولاتمان چۆڵ بکەین وەلەسەر غەریبایەتی ئارام بگرین. ژیانی تاڵ چاکترە لەژێردەستەی دوژمنی ناکەس. وە(کونەپەپوو) لەگەڵ ئێمەدا ڕێك ناکەون بەشتێکی زۆر گراننەبێ کەلەتواناماندا نەبێ، زاناکان ووتوویانە: دوژمنت کەمێك لەخۆت نزیك بگرە لەبەرسوودی خۆت، بەلام هەرگیز مەیەڵە زۆرنزیك بێت کەبەسەرتا زاڵ ببێ و جێگات پێ لێژ بکات، ئەمەش وەکو چڵەدارێکی چەقاو لەهەتاوداوایە ئەگەر تۆزێك خوارت کردەوە سێبەرەکەی زیاد ئەبێ. بەلام ئەگەر زۆر خوارت کرد لەئەندازە تێ پەڕی ئەبینی کەسێبەری کەم ئەبێ. ئێمەش دوژمنمان بۆنزیکبوونەوە بەکەم لێمان ڕازی نابێ, ئەمە بیری ئێمەیە و شەڕیش بەدەست خۆتە ئەی پادشا.

پادشا بە وەزیری پێنجەمی ووت: تۆ ئەڵێی چی؟

کامیان بەباش ئەزانی: شەڕ یان ڕێکەوتن یان بەجێهێشتنی نیشتیمان.

ووتی: شەڕ کردن بەکار نایەت بەرامبەر بەیەکێك کەدەسەلاتت بەسەریا نەبێ. پێشینان ووتویانە: ئەوەی بەرامبەر یەکێك بوەستێ کە دەسەلاتی بەسەریا نەبێ خۆی ئەدات بەکوشت, بزانە پیاوی ژیر هەرگیز دوژمن بەکەم نازانێ هەرجۆرێك ببێ لە گەورە هەتا بچووك. ئەوەی دوژمنی بەکەم بزانێ لێی ڕزگارنابێ, ئەگەر(کونەپەپوو) شەڕیش نەکەن من هەرلێیان ئەترسم وەلەوەوپێشیش هەرلێیان ئەترسام، پیاوی

ژێر لەدوژمنی خۆی دڵنیانابێت ئەگەردووربێت لەهەڕەشەی، ئەگەر نزیك بێ لەپەلاماردانی وەئەگەر تەنهاو بێکەس بێت لەفێڵی دڵنیانابێ. چاکترین و ژیرترنی نەتەوە ئەوەیە کە واز لەکوشتار بێنێ لەبەر ژیانی ئاسوودە کە ئابووری و ئازادی وەکاروباری لێوە دەست بکەوێ، بەڵام کوشتار لاشەی تیا لەناو ئەچێ وەخوێنی تیائەڕژێ بیرلەکوشتاری (کونە پەپوو) مەکەرەوە ئەی پادشا.

ئەگەر پادشا نهێنی قایم و وەزیری چاك هەڵبژێرێ وەلەبەرچاوی مرۆڤ گەورەو سەربەرزو دوربێ لەکەوتن بەڕاستی ئەبێ چاکەی لێ نەبڕێ.تۆئەی پادشا کەبەم جۆرە پرست بەمن کرد کەنهێنی و ئاشکرای تیادایە. نهێنی شوێن و پایەی خۆی هەیە.جاری وا هەیە چەند کەسێك قسەی لێ ئەکەن. وەنهێنی هەیە کەنەتەوەیەك پشتی پێ ئەبەستێ، وەنهێنی هەیە کەدوکەس قسەی تیادا نەکەن. بۆئەم نهێنییە من وای بەباش ئەزانم کەلەدوزمان و چوار گوێ زیاتر کەس هاوبەش نەبێ.

پادشا خێرا هەستاو لەگەڵ وەزیرەکەدا چوونە ژووری تایبەتی یەوە. یەکەم پرسیاری تایبەتی پادشا ئەوە بوو پێی ووت:

ئایا ئەزانی بناغەی دوژمنایەتی ئێمەو کونەپەپوو لەچییەوە بوو؟ وەزیرەکە ووتی: بەڵێ لەبەر قسەیەك بوو قەلەڕەشکەیەك لەدەمی دەرچوو. پادشای قەلەڕەشکە ووتی: ئەوە چۆن بووە؟

وەزیرەکە ووتی: ئەگێڕنەوە کۆمەڵێك قوڵنگ پادشایان نەبوو بڕیاریاندا کەپادشای (کونە پەپوو) بکەن بەپادشای خۆیان. لەو کاتەدا قەلەڕەشکەیەك لەناویاندا نیشتەوە ئەوانیش بۆئەو کارە پرسیان پێ کرد ووتی: ئەگەر باڵندە لەجیهاندابڕا هەرگیز (کونە پەپوو )مەکەن بە

پادشای خۆتان چونکە لە هەموو باڵندەیەك ناشرین تر. وەبێ مێشك و تووڕەن وەلەهەموبەزیی و دڵسۆزی یەکەوە دوورن لەگەڵ ئەوەدا کە بەڕۆژ کوێرو هەڵەشەو بەدکارن، تۆزێك بیربکەنەوە هەروا بزانن کەئەو پادشاتانە، بەڵام بەبیری خۆتان کاربکەن وەك ئەو کەروێشکەی ئەی ووت مانگ پادشامە، بەڵام بەبیری خۆی کاری ئەکرد.قولنگەکان وتیان: ئەوەچۆن بووە؟

قەلە ڕەشەکە ووتی: زەوییەك لەخاکی فیل ئاوەکەی دێتە کزی و ووشکبوون، فیلەکان هاوار ئەبەنە بەر پادشاکەیان ئەویش بەهەموو لایەکدا سەربازبڵاوئەکاتەوە.لەپاشا ئاگاداری ئەکەن کەسەرچاوەیەکیان دۆزیوەتەوە پێی ئەڵێن (سەرچاوەی مانگ). ئەو سەرچاوەیە لەخاکی کەروێشکدا ئەبێ. فیلەکان زۆر لەکەروێشکەکان ئەپلیشێننەوەو ئەیان کوژن.

کەروێشکەکان هاوار ئەبەنە بەرپادشاکەیان بۆدۆزینەوەی چارە، پادشا زانایانی کۆکردەوە بۆئەوەی کەچارەیەك بدۆزنەوە ڕزگاریان بکا. لەپاشا کەروێشکێکی زیرەکی هەڵبژارد کەپێیان ئەووت ((فەیروز)) ناردی بۆلای پادشای فیل و پێی ووت: بزانە کە(نێراو) ڕادەی تێگەیشتنی ئەوکەسە دەرئەخا کەناردوویەتی ئەویش بەنەرمی و بیرو هۆشی چاك. تۆش بەنەرمی و ژیری و لەسەرخۆ قسەبکە چونکە هەر (نێرراو)ە کەبەنەرمی دڵان نەرم ئەکا. وەبەبێ هۆشی و نەزانی دڵان ئەڕەنجێنێ.

(فەیروز) شەوێکی مانگەشەو چووە سەرشاخێك وەبانگی لەپادشای فیل کردوو ووتی: خواوەند(مانگ) منی ناردووە کە پێت ڕابگەیەنم ئەوەی کە بە هێزی خۆی بنازێ بەسەر بێدەسەڵاتاندا تووشی سزا

ئەبێ. تۆ بەئارەزوو هاتووی بۆ ئەو کانییەی کەبەناوی منەوەیە، ئاوت لێ خواردوەتەوە لیڵت کردووە. ئەگەر جارێکی تر کاری وا بکەیت هەردوو چاوت کوێر ئەکەم. ئەگەر باوەڕ ناکەی وەرە بۆسەر کانییەکەی من.

(پادشای فیل) زۆر سەری سوڕما وەچوو بۆکانییەکە.

(فەیروز) ووتی: سەیری ئاوەکەبکە، کەسەیری کرد وێنەی مانگی تیادی (فەیروز) پێی ووت:

لمۆزت بخەرە ئاوەکەوە. فیلەکە لمۆزی خستە کانیەکەوە ئاوەکە شڵەقا وایزانی کەمانگ ڕقی هەستا. ووتی: وابزانم کە مانگ تووڕە بووە کە لمۆزم خستە ئاوەکەیەوە؟ (فەیروز) ووتی: بەڵێ! فیلەکە زۆرترساو سەری بۆ مانگ خستە سەر زەوی وەزۆر پەشیمانبووەوە سوێندی خوارد کە جارێکی تر نەخۆیو نەسەربازی نەگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنە.

(قەلەڕەشکە) ووتی: جگە لەم قسانە کەبۆمکردن (کونە پەپوو) خراپ و زۆردارو فێڵ بازن. وەپادشاکەیان لەهەموویان خراپ ترو فێڵبازترە. ئەوەی قسەی ئەو جۆرە پادشایانە لەگوێ بگرێ ئەوەی بەسەردا دێ کەبەسەر (کەروێشك) و(سوێسك)[1] دا هات کە(پشیلە) بوو بە دادپرسیان.[2] (قولنگەکان) ووتیان: ئەوە چۆن بووە؟ (قەلەڕەشکە ووتی: (سوێسکێك) دراوسێم بوو زۆر جار هاتوچۆی ئەکردم، لەپاش ماوەیەك دیارنەبوو. (کەروێشکێك) هاتە شوێنی و کردی بەهێلانەی خۆی. ڕۆژێك لەناکاو (سوێسکەکە)پەیدابوو لەگەڵ کەروێشکەکەدا

[1] سوێسك – ناوی باڵندەیەکە

[2] داد پرس– حاکم

لەسەر هێلانەکە شەڕیان بوو بڕیاریاندا کەبچن بۆلای قازی. (سوێسکەکە) ووتی: قازی نزیکە لێرە لە قەراخ دەریادا پشیلەیەکی خواپەرست هەیە ڕۆژ بەڕۆژوەو شەو هەتا بەیانی نوێژ ئەکا، گۆشت خۆر نییە ژیانی لەسەر گژوگایەو ئازار بەکەس ناگەیەنێ.

هەردووکیان چوون بۆلای، منیش شوێنیان کەوتم کەبزانم ((فەرمان ڕەوا))[1] ی نوێژ کەرو ڕۆژو گر چۆنە. پشیلەکە لەدوورەوە چاوی پێیان کەوت هەستا دەستی کرد بەنوێژ کردن و پاڕانەوە.

ئەوانیش زۆر سەریان لەکاری سوڕماوە بەشەرمەوە لێی نزیک بوونەوەو سڵاویان کرد، لەپاشا داوایان لێکرد کە ئەو کارەیان بۆ ڕوون بکاتەوە، ئەویش ووتی: سەر گوزشتەتانم بۆ بگێڕنەوە. بۆیان گێڕایەوە ووتی: وەرنە پێشەوە من پیرم و گوێم گرانە تێم بگەیەنن. ئەوانیش چوونە پێشەوەو سەرگوزشتەیان بۆدوبارەکردەوە. ووتی: لەپێش هەموو شتێکدا داواتان لێ ئەکەم کەلەخوا بترسن وەڕاست بڕۆن چونکە مرۆڤی ڕاست هەمیشە سەرکەوتووە هەرچەندە کە زۆر لێ کراو بێ، بەڵام درۆزن هەر لەژێرەوەیە هەرچەندە کەکاری لەبرەوا بێ. لەجیهاندا هیچ بەکار نایە. نەماڵ نەکوڕ نەبرا تەنها کاری چاك نەبێ.

پیاوی ژیر ئەبێ هەواڵی قازانجی سبەینێ بداو واز لەکارو باری ئەم جیهانە بێنێ. نرخی پارە لای مرۆڤی دانا وەك نرخی خۆڵ وایە بەڵام نرخی مرۆڤ بۆچاکەو خراپە وەکو نرخی خۆی سەیر ئەکا. بەم جۆرە پشیلەکە ئەم قسانەی بۆ ئەکردن هەتا دڵنیابوون وەبەتەواوی لێی نزیك بوونەوە، لەپڕ پەلاماری دانێ و هەردووکی کوشتن.

---

[1] فەرمان ڕەوا – حکومەت

لەپاشان (قەلەڕشکە) ووتی: جگە لەو قسانەی کەبۆم کردن (کونەپەپو)بەدکارن ئیترمن ڕازیم نییە کە(کونەپەپوو)بکەن بەپادشاتان.

کاتێ(قولنگەکان) ئەو قسانەیان لەقەلەڕەش بیست وازیان لەپادشای (کونەپەپوو) هێناو نەیان ویست.

لەکۆمەڵەکەدا (کونەپەپوویەك) هەبوو کەئەو قسانەی گوێ لێ بوو بەقەلەڕەشەکەی ووت: ئازارێکت پێ گەیاندم کەلەبیرم نەچێتەوە، نازانم من کەی خراپەیەکم دەر ارەی تۆ کردوە کەبەم جۆرە ئەم قسانەت کرد، بەڵام بزانە تەور دارئەبڕێ بەڵام ئەڕوێتەوە،شمشێرگۆشت لەت ئەکاچاك ئەبێتەوە، بەڵام زمان هەرگیزبرینی چاك نابێتەوەو دەرمانی نیە. تیرلەگۆشتتدا وون ئەبێ لەپاشان دەری دێنن، بەڵام تیری قسە کەگەیشتەدڵ هەرگیز دەرنایەت. هەمووسوتاوییەك ئەکوژێتەوە: ئاگربەئاو،زەهربەدەرمان،خەفەت بەئارام.بەڵام ئاگری کینە هەرگیز ناکوژێتەوە. ئەی کۆمەڵی قەلەڕەشکە داری دوژمنایەتی و ڕق وکینەتان لەگەڵ ئێمە ڕواند.

کە(کونەپەیوو) قسەکەی تەواوکرد بەتوڕەییەوە ڕۆیشت و هەموو قسەکانی قەلەڕەشکەی بۆپادشای(کونەپەپو) گێڕایەوە. لەپاشا قەلەڕەشکە زۆرپەشیمان بووەوە لەوقسانەی کەکردی لەدژی (کونەپەپوو). لەدڵی خۆیدا ووتی: زۆربەهەڵەداچووم لەوقسانەدا کە بە خۆڕایی دوژمنایەتی و ڕق وکینەم پێ هێنابەسەرخۆم ونەتەوەمدا. خۆزگە ئەوقسانەم بۆقولگەکان نەکردایە لەوانەیە کەزۆر لەباڵندەکان ڕەووشتی(کونەپەپوو)وەك من شارەزابن، بەڵام باسی ناکەن لەترسی ئەوەی کەمن لێی نەترسام، وەلەبەر ئەنجامی بەدی قسەی سووك و

ناشرین کە ڕق و کینە ئەنێژێ وەلەتیر خراپترە. مرۆڤی ژیر هەرچەندە خاوەن دەسەلات و بەهێزبێ هەرگیز قسەیەکی وا ناکات کەلەئەنجامدا خراپەو فەلاکەت بەسەر خۆی و نەتەوەیدا بهێنێ. وەئەگەر (تلیاکی) لەلابێ (زەهر) ناخواتەوە بەپشتیوانی ئەو. پیاوی ڕاستی بەکار ئەگەر قسەش زۆر نەکات لەکارو باردا هەر شوێنی شانازییە، بەڵام قسەکەر هەرچەندە کە گفتوگۆی ڕێك و جوانبێ سوپاسی ئەنجامی قسەی بەو جۆرە ناکرێ. وە من خاوەنی ئەوقسانەم کە ئەنجامیان باش نییە ئەمەش گەورەترینی گەوجییە کەپیاو لەکارێکی گەورە بچێتە پێشەوەو قسەبکا بەبێ ئەوەی کەپرس بەزانایان و ژیرو تێگەیشتوو بکا، وەلەئەنجامدا شاد نابێ وەتووشی سەختی و گیرو گرفت و هەڵە ئەبێ. بەم جۆرە قەلە ڕەشکە سەر زەنشتی خۆی کردو ڕۆیشت.

ئەمەبوو بناغەی دوژمنایەتی ئێمەو (کونە پەپوو) کە پرسیارت لێ کردم. خۆت ئەزانی کەحەز لەکوشتار ناکەم، بەڵام ئەوندە چارەو فێڵ ئەزانم کەسەرکەوتنی ئێمەی تیادایە، چونکە دوور نییە کەپیاو بەهۆی بیرکردنەوەوە بگات بەئامانج، وەك ئەوکەسانەی کەبەفێڵ بزنەکەیان لە(خوا پەرستەکە)سەند، پادشاکە ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ وەزیرەکە ووتی:

ئەگێڕنەوە (خوا پەرستێك) بزنێکی قەڵەو لەدێیەك ئەکڕێ ملی ئەگرێ بەرەوماڵەوە. لەڕێگادا چەند کەسێکی زۆرزان بڕیار ئەدەن کەلێی بسێنن.

یەکێکیان بەتەنها ئەچێ سەری ڕێگای لێ ئەگرێ و پێی ئەڵێ: ئەو سەگە چییە لەگەڵتا ئەی خوا پەرست؟ لەپاشا یەکێکی تریان لەلایەکی ترەوە ڕێگای پێ ئەگرێ و پێی ئەڵێ:

خوا پەرستی وانابێ. کەی خوا پەرست سەگی ڕاکێشاوە؟ بەم جۆرەقسانە خواپەرستەکەیان والێ کرد وایزانی کەبزنەکە سەگە، وەئەوەی کەپێی فرۆشتووە جادووی لێ کردووە، بەرەڵای کردوو وازی لێ هێنا. لەپاشا فێڵبازەکان بردیان بۆ خۆیان. لەبەر ئەوە ئەم قسەیەم بۆکردی کەبزانی من هیوام وایە کەبەنەرمی و بیرکردنەوەو فێڵ بگەین بەئامانج. ئێستاش من داوالەپادشائەکەم لەسەر دەستی چەند کەسێکدا فەرمان بدات کەپەڕبەلەشمەوە نەهێڵن بەدەنووک هەمووی هەڵبکەنن. لەپاشا لەژێر ئەو دارەدا فرێم بدەن ئێوەش بەجارێك بار بکەن بۆ فلان شوێن وەخۆتان بشارنەوە، هیوام وایە کەئارام بگرن هەتا هەموو شوێن وقەڵاو دەرگاو کارو باریان بەتەواوی شارەزائەبم، لەپاشا فێڵیان لێ ئەکەم و دوایی دێمەوە بۆلاتان. ئەو کاتە پەلاماریان ئەدەینێ و تۆڵەی بەرودوایان لێ ئەکەینەوە. پادشا ووتی: ئەوە بەڕاستتە ئەو قسەیە ئەکەی؟ وەزیرەکە ووتی: بەڵێ بەڕاستمە، چونکە ئەم کارە گەورەترینی حەسانەوەو خۆشی بۆ ئێمە تیادایە .

(پادشای قەلەڕەشکە) فەرمانیدا هەروەکو خۆی ووتی بەدەنووك پەڕیان بەهیچ شوێنێکی لەشییەوەنەهێشت وەلەژێر ئەودارەدا کەنزیکی مەڵبەندی (کونە پەپوو)بوو فرێیاندا.

(قەلەڕەشکە) لەوێدا ئەی ناڵاند (کونەپەپوو) پێیانزانی زۆری پێ نەچوو (پادشای کونەپەپوو) خۆی هات بۆلای فەرمانیدا کەقسەی لەگەڵدا بکەن، لێیان پرسی تۆکێی؟ وەقەلەڕەشکەکان چیان لێ هات؟ ووتی: ناوم فلانە، ئێستا لەبەر ئازاری گیانم هیچ نازانم. لەپاشا وەزیرەکان پادشایان تێگەیان کەئەمە وەزیری گەورەی قەلەڕەشکەو

شوێنی نهێنی و پرسی پادشایە. لەپاشا لێیان پرسی کەلەبەر چی بەو دەردەیان بردووە؟ ووتی: پادشامان لەکۆبوونەوەدا لەبابەت ئێوەوە پرسیاری لیّ کردین کەچارەمان چیە؟ منیش ووتم: ئەی پادشا ئێمە هێزمان بەسەرئەواندا نیە، لە ئێمەخاوەن دەسەلاّت ترن من وابەچاك ئەزانم کەسالانە باجیان بدەینیّ ولەگەلّیاندا ڕێك بکەوین، ئەگەربەوەڕازی نەبوون وولاّتمان بەجیّ بێلّین وەووتم: دووژمنی بەهێز بەهیچ جۆرێك پیاو لەدەستی ڕزگاری نابێت بەسەرشۆڕکردن نەبێت وەك(گیا)کە بەهۆی نەرمییەوە لە(ڕەشەبای)بەهێز ڕزگاری ئەبیّ. بەهەر لایەکدا هەلّی کرد ئەویش بەولایەدا خوار ئەبێتەوە. کە ئەم قسانەم پیّ ووتن ڕقیان لەمن هەستاو ووتیان: بەلاّم ئێمە شەڕمان ئەویّ. دیارە تۆ لەگەلّ ئەوانی،وەپەلاماریاندامیّ وەبەم دەردەیان بردم.پادشاوسەربازەکانیشی ڕۆیشتن، ئیترنازانم بۆ کویّ چوون؟

(پادشای کونەپەپوو) بەیەکێك لە وەزیرەکانی ووت: ئەلّێی چی لەم بابەتەوە؟ ووتی: ئەی پادشا بەزووترین کات بیکوژە. ئەمە بەرزترین نەتەوەی قەلەڕەشکەیە. کوشتنی ئەمە حەسانەوەی ئێمەو زیانی قەلەڕەشکەی تیادایە زاناکان ووتویانە:

ئەوەی کە هەلی سەرکەوتنی دەستکەوت و لەکیسی خۆیدا مرۆڤێکی ژیر نیە. وە ئەوکەسەی کە بەشوێن کارێکی گرنگدا بگەڕیّ کە بۆی هەلّکەوت وگوێی نەدایە، بزانە کەلەدەستی دەرچووە، وە لەوانەیە کە جارێکی تر ئەوهەلەی بۆ نەگەڕێتەوە ئەوکارەی دەست نەکەوێتەوە. وە ئەو کەسەی کەدوژمنی بەداماوی هاتەبەردەست ولەناوی نەبرد ئەوکاتە پەشیمان ئەبێتەوە کەجارێکی تر هێزی پەیدا کردەوەودەسەلاّتی بەسەریا نەما.

پادشا بە وەزیرێکی تری ووت: تۆ ئەڵێی چی؟ وەزیرەکە ووتی: من وای بەچاك ئەزانم کە نەی کوژی، چونکەدوژمنی هەژاری بێکەس بە تایبەتی دراوسێی ترساو مافی ئەوەی هەیە کەرێزی بگیرێ و دڵنیا بکرێ. پادشا بەوەزیرێکی تری ووت: تۆبیرت چۆنە؟ ووتی: من ئەڵێم کەوازی لێ بێنی وەچاکەی لەگەڵدابکەی،دوورنیەکەئامۆژگاریت بکاتو سودمان پێ بگەیەنێ. پیاوی ژیرودانا دوژمنایەتی ئەخاتەنێوانی دوژمنانی خۆیەوە وەبەیەکترەوە خەریکیان ئەکا لەبەرڕزگاربوونی خۆی وەك ڕزگار بونی ئەو(خواپەرستە)ی کەلە (شەیتان) و(دز) رزگاری بوو بەهۆی ناکۆکیەوە. پادشاووتی: ئەوەچۆن بووە؟ وەزیرەکەووتی: ئەگێڕنەوە خواپەرستێك(مانگایەکی)دەستکەوت،گوریسێکی خستەملی وبەرەوماڵەوە بردی.(دزێك) شوێنی ئەکەوێت کەلێی بدزێ.هەر لەو کاتەدا شەیتانیش شوێنی ،ئەکەوێ کەخواپەرستەکە ببات، چونکە پیاوێکی ئاینییە .

لەگەڵ کابرادا ئەبن بەهاوڕێ وەبڕیارئەدەن کە (خواپەرست) نووست کاری خۆیان بکەن. شەو دزوشەیتان ناکۆکییان تێکەوت. (شەیتان) ئەیووت تۆ پەلەمەکە هەتامن خواپەرستەکە ئەبەم، چونکە ئەگەر تۆ مانگاکە بەریت من ئەترسم خواپەرستەکە ئاگای بێتەوەو هاواربکاو دراوسێکانی کۆببنەوە، ئیترمن بۆم نابرێ. (دزەکەش) ئەیووت، نەخێر تۆئارام بگرە هەتا مانگاکە ئەبەم ئیترچی ئەکەی بیکە .

لەم مشتوومڕدا بوون (دزەکە) ڕقی هەستاوهاواریکرد: ئەی (خواپەرست) ئاگات لەخۆتبێ ئەمە شەیتانە ئەیەوێت بتبا. شەیتانیش هاواری کرد ئەمەدزە ئەیەوێ مانگاکەت بەرێ (خواپەرست) لەو

دەنگەدەنگە ئاگای بووەو ئەوانیش ڕایانکرد کە وەزیرەکە قسەکەی تەواو کرد پادشا ووتی: ڕاست ئەکەی.

وەزیری یەکەم کە فەرمانی کوشتنی قەلەڕەشکەی دابوو ووتی: وابزانم قەلەڕەشکە تەفرەی دان و قسەکانی لەدڵی گەوجەکانتاندا جێگیر بوو، ئەتانەوێ کەکار لەشوێنی خۆیدا نەکەن، ڕاوەستە ئەی پادشا ڕاوەستە لەم کارەدا پەلە مەکە. پادشا ئاوڕی لە قسەکەی نەدایەوە فەرمانیدا کە قەلەڕەشکە بەڕێز هەڵبگیرێ بۆ(کۆشکەکانی کونە پەپوو) و بەچاکە لەگەڵیدا بجوڵێنەوە .

لەپاشاڕۆژێك(قەلەڕەشکە)لەکۆبونەوەیەکدا بە(پادشای کونەپەپووی) ووت، ئەو وەزیرەیش دانیشتبوو کە فەرمانی کوشتنی دابوو:

ئەی پادشا خۆت ئەزانی کەچیم بەسەردا هات بەدەستی قەلەڕەشکە. من حەسانەوەم نیە هەتا تۆڵەی منیان لێ نەسێنی، زاناکان ووتویانە: ئەوەی لەڕێی خوادا ئارەزووبکات خۆی بسوتێنێ[١] لەهەمووکەس لەخوانزیك ترە، وەهەرپاڕانەوەیەك بکات گیرا ئەبێت. ئەگەرپاد شافەرمانبدات خۆم ئەسووتینم وەلەخوائەپاڕێمەوە کەبمکات (بەکونەپەپوو) هەتادوژمنایەتی‌ودەسەلاتم بەهێزترئەبێت بەسەر قەلەڕەشکەدا. ئەو وەزیرەی کە فەرمانی کوشتنی دابوو ووتی: هەی فێڵباز بەم جۆرە لەسەرەوە خۆت بەچاك نیشان ئەدەی بەڵام لەژێرەوە وەك قاپێك (مەی[٢])ی پاکی جوان کەزەهری لەناودا توابێتەوە هەمووخراپەیەکت لێ ئەوەشێتەوە، ئەزانی ئەگەر لاشەتمان سوتاند

---

[١] ئەم ئاینەلەهینددا هەیە.

[٢] مەی -شەراب.

ڕەوشت وخوت لێت جویێ نابنەوە وەلەگەڵتائەگەڕێن وەهەرئەچیتەوە سەر ڕەگەزو بنەچەی خۆت؟ وەك ئەومشكەی كە مێردیان بۆ هەڵبژارد لەناو (ڕۆژ) و (هەور) و (با) و(شاخ) كەچی هیچیانی نەویست مشك نەبێ. كۆمەڵەكە ووتیان ئەوەچۆن بوو؟ ووتی:

ئەگێڕنەوە (خواپەرستێك)هەبوو كەپاڕانەوەی گیرائەبوو. ڕۆژێك لەكەناری دەریادا دانیشتبوو خواپەرستی ئەكرد لەپڕ (كۆلارەیەك) بەسەریا تێپەڕی بەچكەمشكێكی بەقاچەوەبوو كەوتەبەردەمی. زۆر بەزەیی پیاداهاتەوە، لەوەترسا كەمناڵەكانی باش پەروەردەی نەكەن، لەخواپاڕایەوە بەچكەمشك بوو بەكچێكی جوان، وەلەگەڵ خۆیدا بردیەوە بۆماڵەوە، بەژنەكەی ووت: ئەمەكچمە وەكوكوڕەكەم ڕێزی بگرە.

كچە گەورەبوو خواپەرست پێی ووت: كچم ئارەزوووی كێ ئەكەی هەتا بتدەم بەشوو؟ كچەكە ووتی: ئارەزووی كەسێك ئەكەم كەلەهەموو شتێك بەهێزتر بێ. خواپەرستەكە چووبۆلای (ڕۆژ)وپێی ووت: ئەی دروستكراوی گەورە كچێكم هەیەحەز لە بەهێزترینی هەمووشت ئەكا. ڕۆژ ووتی: (هەور) لەمن بەهێزترە، چونكە دامئەپۆشێ، شەوق وگەرمیم بۆسەرزەوی ناهێڵێ.خواپەرستەكە ڕوویكردە(هەور)، هەوریش ووتی: (با)لەمن بەهێزترە چونكە بەهەمولایەكدا ئەمگێڕێ ودەسەڵاتم بەسەریا نیە. خواپەرستەكە هاواری بردەلای (با). (با)ووتی (شاخ[1]) لەمن بەهێز ترە، چونكە ناتوانم بیجولێنم. چووبۆلای (شاخ) ئەویش ووتی: (مشك)لەمن بەدەسەلات ترە كونم ئەكاو ئەم كا بەخانوو. (خواپەرست)

---

[1] شاخ- كێو.

چووبۆلای (مشک) وپێی ووت: تۆئەم کچەمارەئەکەی؟ ووتی: کونەکەم بچوکە (مشک) هەر (مشک)مارە ئەکا. خواپەرستەکە لەسەرئارەزووی کچەکە لەخواپاڕایەوە جارێکی تر بووەوە بە(مشک) ولەگەڵ مشکەکەدا ڕۆیشت .

(پادشای کونەپەپوو) گوێی نەدایە قسەی وەزیرەکەی وەهەر فەرمانی ئەدا کەبەچاکەلەگەڵیدابجولێنەوە.ڕۆژبەڕۆژ ژیانی خۆشترئەبوو وەپەڕوباڵی بەجارێك دەرهاتەوە. وەلەهەمووشتێك ئاگاداربوو. لەپڕێکدا بەدزییەوە دەرچوو هاتەوە بۆ ناو قەلە ڕەشکەکان وەبەپادشای ووت:

(کونەپەپووەکان) لەفلانە شوێن لەشاخێکی دارستاندان. لەوێدا شوێنێك هەیە ئاگری کردوەتەوە. ئەیخەینە ناوهێلانەکانیانەوەوبەباڵ باوەشێنی ئەکەین. هەر(کونەپەپوویەك) هاتەدەرێ ئەسوتێ ئەوانی تریش لەژوورەوە بەدووکەڵ ئەخنکێن. قەلەڕەشکەکان ئەوفەرمانەیان بەجێهێنا وەکونەپەپوویان بەیەکجارلەناوبرد، وەبەخۆشی وکامەرانی گەڕانەوەبۆشوێنی خۆیان .

لەپاش ماوەیەك (پاشای قەلەڕەشکە) بەو وەزیرەی ووت چۆن ئارامتگرت لەهاوڕێیەتی (کونەپەپوو) کەپیاوچاك ناتوانێ لەگەڵ تاوانباردا هەڵبکات؟ وەزیرەکە ووتی: ڕاست ئەکەی پادشام، بەڵام ئەگەرمرۆڤی ژێرتووشی کاری سەخت بوو هەرگیز لەئارامگرتن زویرنابێ، وەسەرشۆڕی بۆلەخۆی کەمتر بەلاوەگراننییە هەتابەئەنجامی کاری شاد ئەبێ.

پادشاووتی: لەزانینی (کونەپەپوو) ئاگادارم بکە.

ووتی: زانام تیانەدیون تەنها ئەو وەزیرەیان نەبێت کەفەرمانیدا بەکوشتنم، وەگەلێ جار هانی ئەدان کەبمکوژن، بەڵام سوودی نەبوو.

زۆر نەتەوەیەکی بێ هۆشبوون ئەیانزانی کەمن وەزیری قەلەڕەشکەم وەخاوەنی زانین و هونەرم کەچی لەفێڵم نەئەترسان وەنهێنی خۆیان لێ نەئەشاردمەوە. زاناکان ووتوویانە: لەسەر پادشا پێویستە کەخۆی بپارێزێ لەدوژمن ودووزمان وەنەیەڵێ هەرگیز شوێنی نهێنی ئەوبزانن.

پادشاووتی: وادیارە زۆرداری وپادشای نەزان و پەسەندکردنی قسەی وەزیری خراپ (کونەپەپوو)ی لەناوبرد. وەزیرووتی: ڕاست ئەکەی ئەی پادشا وەبزانە کەم هەیە کەخاوەن سامان بێ و قسەی لەگوێ نەگیرێ. وەزۆرخۆر نزیکە لەنەخۆشی. هەروەها قسەی وەزیرانی خراپ پادشا ئەخاتە گێروگرفتەوە. پێشینان ووتویانە: پیاوی لەخۆبایی ستایش ناکرێ وەفێڵباز بەخاوەنی هاوڕێ نابێ. وەبەدکار گەورە نابێ، وەڕەزیل توشی چاکە نابێ. وەئەوەی کە سورە لەسەر گوناە، گوناهی کەم نابێ وەپادشای فێڵبازی کەمتەرخەم لەکاروبارداو خاوەنی وەزیری خراپ دەوڵەتی پێ ڕاناگیرێ.

پادشاووتی: بەڕاستی بارێکی قورست خستەسەرشانت بەوەی کەکرت بە(کونەپەپوو) وەئازارێکی زۆرت هەڵگرت کەبەوجۆرەخۆت بەکەساس وداماو نیشان ئەدان.

وەزیرەکە ووتی: ئەوکەسەی باری قورس هەڵبگرێ بەهیوای ئامانج، نابێ بیرلەپیاوەتی و گەورەیی بکاتەوە هەتا بەئامانج ئەگات ئەوکاتە بەزاناو هونەرمەند ناوی ئەبرێ. وەك(ئەوڕەشمارەگەورە)یەی کەئارامی گرت لە ژێرسواربوی (پادشای بۆق) بەسەرپشتییەوە ئیتربەوە ژیانێکی خۆشی بۆخۆی دامەزراند .

(پادشای قەلەڕەشکە)ووتی: ئەوەچۆن بووە؟ وەزیرەکە ووتی: ئەگێڕنەوە ڕەشمارێکی گەورە پیر ئەبێ وچاوی کزئەبێ وهێزی پەلاماردانی نامێنێ. ڕۆژێك لە کانییەکدا خۆی فڕێ ئەدا وەك نمونەی هەژاری و کەساسی، بۆقێك پێی ئەڵێ: ئەوە بۆچی خەفەت ئەخۆی ئەی مار؟ مارەکە ووتی: خەفەت بۆمن باشە کەلەوەپێش ژیانم لەسەر خواردنی بۆق بوو، ئێستا کارەساتێکم بەسەردا هاتووە کەناتوانم زیان بەهیچ بۆقێك بگەیەنم. بۆقەکە خێرا چووبۆلای پادشاکەیان وەمژدەی دایە بەوەی کەلەمارەکەی بیست (پادشای بۆق) هات بۆلای (مار) وپێی ووت، چیت لێ قەوماوە؟ مارەکەووتی، بەدوای بۆقێکدا ڕام کرد خۆی کرد بەماڵی (خواپەرستێك)دا منیش نەمزانی قەپمکرد بەپەنجەی کوڕەکەیداو پێوەمدا ومرد. ئیتر ڕامکردە دەرەوە. (خواپەرستەکە) ووتی، یاخوا ببی بەووڵاخی (پادشای بۆق) وەتامی خواردنت بۆنەکرێ جگەلەوەی کەئەو بەشت ئەدا، ئێستا منیش هاتوم کەسواری پشتم ببی وەهیچ بەلامەوە گراننیە. (پادشای بۆق) حەزیکرد کەسواری پشتی ئەو ڕەشمارە ببێ، وەئەوەی بەشانازی هاتە پێش چاو، وەزۆری پێ خۆشبوو. لەپاشا مارە کەووتی، ئەی پادشا خۆت ئەزانی کەمن خواردنم لێ قەدەغەکراوە. هەرچی تۆ نەمدەیتێ بۆم ناخورێ. خواردنێکم بۆ دابنێ کەپێی بژیم. (پادشای بۆق) ووتی: بەسەری خۆم هەتا تۆ ووڵاخی من بی ئەبێ موچەت ببێ. فەرمانیدا کەهەموو ڕۆژێك دوو بۆقی گەورەی بۆ ببەن کەبیخوات، ئیتربەو جۆرە مارەکە ژیا وەئەوسەرشۆڕییەی بۆ دوژمنی کەمدەست زیانی پێ نەگەیاند، بەڵام سوودی وەرگرت و لەدەستی مردن ڕزگاری بوو. هەروەها ئارام گرتنی منیش بۆئەم سودەگەورەیەبوو کەدەستمان کەوت، بزانە ئەی پادشا

سەرکەوتن بەهۆی نەرمی وئارام و لەسەرخۆییەوە خێراترو بەهێزترە لەسەرکەوتنی توندی و هەڵەشەیی و لەخۆبایی بوون، ئاگربەگەرمی و توندی تەنها بەشی سەرووی دار لەزەویدا ئەسوتێنێ، بەڵام ئاو بەساردی و بەنەرمی ئەچێتەناخی زەوییەکەوەو بەڕەگ و ڕیشەیدا ئەچێتەخوارەوە. زاناکان ووتویانە:

چوارشت هەیە هەرگیز بەکەم دانانرێن هەرچەندە کە کەم بن (ئاگر)، (دوژمن)، (نەخۆشی)، (قەرزاری).

(قەلەڕەشکەی وەزیر) ووتی: ئەمانەش بەهۆی گەورەیی وکامەرانی و زانایی پادشای گەورەوەبوو. پیشینان ووتویانە: ئەگەردووکەس بۆکارێك گەڕان ئەوەی زووتر دەستی کەوت پیاوەتی لەوی تر بەرزترە.

وەئەگەر لەپیاوەتیدا وەك یەکبن بەئارام ترە وەئەگەر لەوەشدا وەك یەکبوون لەوخاوەن بەخت و بەختیارترە زناکان ووتویانە: ئەوەی کەشەڕ لەگەڵ پادشایەکی بەدەسەڵات وژێردابکات خۆی لەناو ئەبا بەتایبەتی ئەگەر ووریاو زانابێ، وەشوێنی توندیونەرمی ولێبوردن و پەلەبزانێ وەسەیری ئەمڕۆوسبەینێ و ئەنجامی کاربکا وەکوتۆ ئەی پاشا.

پادشاووتی: نەء، ئەمانە هەمووی بەهۆی زانایی تۆوە بوو چونکە بیری یەك کەسی ژیری زانا چاکترە لەگەڵێك سەربازی ئازای نەبەرد بۆ لەناوبردنی دووژمن. ئەمەش شتێکی سەیرە کەتۆئەوماوە زۆرە لەناو (کونەپەپوو) مایتەوە و قسەیەکت هەڵە نەکرد کەزیانمان پێ بگەیەنێ ,

وەزیرەکە ووتی: من هەرلەسەر ڕەوشتی بەرزی تۆم وەلەسەرقسەی ئێوە کارئەکەم ئەی پادشا.

لەگەڵ دوورونزیکدا بەنەرمی ودڵسۆزی وخۆشەویستی وئارام ئەبم بەهاوڕێ.

پادشاووتی: تۆ زۆربەکاری، بەڵام وەزیرەکانی ترم هەرقسەیان هەبوو کەئەنجامی چاك نییە. ئێمە لەوەوپێش خەووخۆراکمان نەبوو لەترسی (کونەپەپوو) خوابەهۆی تۆوە ڕزگاری کرین زاناکان ووتویانە: نەخۆش حەسانەوەی نیە هەتاچاك ئەبێتەوە وەرۆڤی چڵێس هەتا کاری بۆجێبەجێ ئەکرێ وەئەوکەسەش حەسانەوەی نییە کەدوژمن زۆری بۆهێناوەو بەیانی وئێوارە لێی ئەترسێ هەتاڕزگاری ئەبێ. وەئەوەی کەباری قورس لەسەرپشتی لابا ئەحەسێتەوە. وەئەوەی کەلەدوژمنی دڵنیایە حەساوەتەوە.

وەزیرەکەووتی:لەخوا داوا ئەکەم کەدوژمنی لەناوبردی ئیتر بەخۆشی وکامەرانی بژیت وەگەل بەچاوێکی ڕۆشن و گەورەوە سەیری تەختت بکەن. ئەگەرپادشا بەوجۆرە سەیرنەکرێ وەك ئەو(مەمکە) وایە کەبەملی (بزن)داشۆڕبۆتەوە(کارژۆلەکە)ی ئەیمژێ بەهیوای (شیر) بەڵام سودی نییە.

پادشای قەلەڕەشکە ووتی: ئاگادارم بکە لەڕەووشتی (کوونەپەپوو) وپادشایان.

وەزیرەکە ووتی:

پادشاکەیان لەخۆبایی و تووڕەو هیچ لەبارانەبوو بەدکاربوو، وەهەموو وەزیرەکانی وەك خۆی وابوون تەنها ئەو وەزیرەیان نەبێ کەفەرمانی پێ ئەدان بەکوشتنم، فەیلەسوفێکی گەورەو زانایەکی بەرزو تێگەیشتووبوو. لەدەروونی بەرزو قسەی ڕاست وبیری چاکیدا وێنەی نەبوو. پادشاووتی: کام ڕەووشتی نیشانەی بەرزی وتێگەیشتی بوو؟

وەزیرەکەووتی: دووپەووشتی: یەکەم ئەوەبوو کە فەرمانیدا بەکوشتنی من. دووەم: هەرگیز ئامۆژگاری لەپادشاکەی نەئەشاردەوە هەرچەن بەکەمیشی بزانیایە. قسەکانیشی بەنەرمی ولەسەرخۆیی ئەکرد. هەندێك جارکەئامۆژگاری ئەکرد ئاگام لێبوو یەکسەرهەڵەکەی پێ نەئەووت، بەڵام پەندی بۆئەووت وسەرگورشتەی بۆئەگێڕایەوەو باسی هەڵەی کەسانی تری بۆئەکرد. ئەویش تێئەگەیشت وەلەهەڵەکانی خۆی ئەهاتەخواری. ئیتربەخۆڕایی پادشاکەی لەخۆی نەئەڕەنجان.

ڕۆژێك گوێم لێ بوو بەپادشای ئەووت:

پادشا ئەبێ هەمیشە ئاگای لەخۆی بێ، چونکە پادشایەتی کارێکی زۆرگەورەیە کەم کەس دەستی ئەکەوێ، بەزانین وئارام و ژیری ونەبەزی نەبێ دەست ناکەوێ. وولاتیش گەورەوبەنرخە ئەوەی کەدەستی کەوت ئەبێ باش پارێزگاری بکات، چونکە بەڕاستی ووتویانە: لەکەمی مانەوەیدا وەك مانەوەی سێبەر لەژێرگەڵای (نیلۆفەڕ[1])دا وەلەئاسانی لەناوچون و هاتن وگەڕانەوەیدا وەك (با) وایە، وە لە مانەوەی کورتیدا وەك(پیاوچاك) لەگەڵ (بەدکار)دا وەلەخێرایی نەمانیدا وەك (بڵقی ئاو)ە لە کەوتنی دلۆپی باران .

ئەمە پەندی دوژمنانە کە پیاو نابێ هەرگیز پێیان دەسخەڕۆ ببێ هەرچەندە کە خۆیان بە دۆست نیشان بدەن .

## دەرگای {کونەپەپوو} و {قەلەڕەشکە}

## تەواو بوو

[1] نیلۆفەڕ – ناوی گوڵێکەس

# دەرگـــــــای

## (مەیمون) و (کیسەڵ)



(دەبشەلیم) پادشای هیند ووتی بە(بەیدەبای فەیلەسووف) ئەو پەندەم بیست ئێستا پەندی ئەو پیاوەم بۆ بلێ کەبەشوێن پێویستیەکدا ئەگەڕێ وەکەدەستی کەوت لەکیسی خۆی ئەدا.

فەیلەسووفەکە ووتی: گەڕان بەشوێنی پێویستیدا ئاسانترە لەپارێزگاری کردنی. ئەوەی کەئامانجی دەستکەوت، بەڵام نەیزانی پارێزگاری بکا ئەوەی بەسەردا دێت کەبەسەر (کیسەڵ)دا هات.

پادشاکە ووتی: ئەوە چۆن بووە؟

(بەیدەبا) ووتی: ئەگێڕنەوە مەیمونێك کەپێیان ئەووت (چالاك) پادشای مەیموون بوو، لەپاشا پیربوو. یەکێك لەشازادەکان پەلاماری دایەو لەسەر تەخت هێنایە خوارێ. مەیمونە پیرەکە سەری خۆی هەڵگرت و ڕایکرد هەتا گەیشتە قەراخی ڕووبارێك، لەوێدا دار هەنجیرێك هەبوو کردی بەشوێنی تایبەتی خۆی.

ڕۆژێك لەسەردارەکە لەکاتی هەنجیرخواردندا هەنجیرێکی لەدەست کەوتە ناوئاوەکەوەو دەنگێکی لێوەهات مەیمونەکە ئەودەنگەی زۆر پێ خۆشبوو لەبەرئەوە هەنجیرێکی ئەخواردوو هەنجیرێکی ئەخستە ئاوە کەوە. لەئاوەکەدا کیسەڵێك هەبوو هەنجیرەکانی ئەگرتەوەو ئەیخواردن. کەئەم کارە درێژەی کێشا. کیسەڵەکە وایزانی کەلەبەر ئەو ئەم هەنجیرانە ئەخاتە ئاوەکەوە. سەری دەرهێناو دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ مەیمونەکەدا. لەپاشان بوون بەهاوڕێی خۆشەویستی یەکتر (کیسەڵ) چەند ڕۆژێك ڕووی نەکردەوەماڵی خۆی. ژنەکەی ئارامی نەما بەدراوسێکەی ووت: ئەترسم کوژرابێت. ئەویش ووتی: نەخێر مێردەکەت لەکەناری ڕووبارەکە لەگەڵ(مەیمونێك)دا بوون بەهاوڕێ. ئەگەر تۆ بەفێڵ ئەومەیمونە لەناونەبەی ئەبێ دەست لەمێردەکەت

بشۆی، خۆت نەخۆش بخە کەهاتەوە بلێ دەرمانی من دڵی مەیمونە. لەپاش ماوەیەك کیسەڵەکە هاتەوە سەیری کرد ژنەکەی نەخۆشە پێی ووت ئەوە بۆچی کەوتووی؟ ژنە دراوسێکەی وەڵامی دایەوە ژنە هەژارەکەت نەخۆشە، پزیشکەکان ووتیان بە (دڵی مەیموون) نەبێ چاك نابێتەوە. کیسەڵەکە ووتی: دڵی مەیمونمان لەکوێ بوو ئێمە لەناو ئاودا ئەژین؟ لەدڵی خۆیدا ووتی: چارەم نییە ئەوەنەبێ کەناپاکی لەگەڵ هاورێکەمدا بکەم و دڵەکەی دەربێنم.

لەپاشان گەڕایەوە بۆ کەناری ڕووبارەکە. مەیمونەکە پێی ووت: گیانەکەم بۆچی دیارنیت؟ ووتی: لەبەر شەرمەزاری خۆم کەنازانم بەرامبەر بەو چاکانەی کەلەگەڵ مندا کردت چۆن پاداشتت بدەوە؟ ئێستا ئەمەوێ کەچاکەو پیاوەتیت تەواو بکەی بەهاتنت بۆماڵی ئێمە. من لەناو(دورگەیەکی[1] ) خۆش و پڕمیوەدا ئەژیم. مەیمونەکە زۆری پێ خۆش بوو لەدارەکە هاتە خوارێ و سواری پشتی کیسەڵەکە بوو. بە مەلە بردی لەڕێگادا بیری کردەوە کەچۆن لەناوی ببا، سەری شۆڕکرەوە بۆناو ئاوەکەو بیری ئەکەردەوە. مەیمونەکە پێی ووت: ئەتبینم وەك مەراقت هەبێ وایە. کیسەڵەکە ووتی: بەخوا ژنەکەم نەخۆشە ئەترسم بەتەواوی نەتوانم میواندارییت بەجێبهێنم.

مەیمونەکە ووتی:

---

[1] دورگە – جزیرە

من خۆم ئەزانم کەتۆ چەندە بەپەرۆشی بۆچاکەی من ئیتر پێوست نییە کەلەبەر من خۆتان ئازار بدەن. کیسەڵەکە ووتی: بەڵێ.

لەپاشا ماوەیەك بەئاوەکەدا ڕۆیشت دووبارە ڕاوەستاو بیری ئەکردەوە.

مەیمونەکە کەدڵی لەکیسەڵەکە پیسکردو لەدڵی خۆیدا ووتی: ئەترسم لەبەر کارێك لەئاوەکەدا بوەستێ و دڵی گۆڕابێ وە دۆستایەتی جارانی نەمابێ، چونکە هیچ شتێك وەکو دڵ بەئاسانی ناگۆڕێ، زاناکان ووتوویانە: لەسەر پیاوی ژیر پێویستە کە ئاگای لەخۆی بێ تەنانەت لەوەی کە لەدڵی کوڕو براو خزم و هاوڕێشدا هەیە لەهەموو هەستان و دانیشتن و کارو کردەوەو قسەو چرپەدا. وەهەموو کاتێکی ترا. ئەمانە هەموو شایەت لەدڵ ئەدەن. زاناکان ووتوویانە: ئەگەر کەسێك دڵی لەهاوڕێیەکی پیسکرد ئەبێ بەئازایی و ئارام خۆی بپارێزێ وەسەیری ڕەوشت و کردەوەو ڕەنگ و ڕووی بکا، ئەگەر ئەوە ڕاست بوو ڕزگار بووە، ئەگەر هەستی درۆشبوو هیچ زیانێکی لێ نەکەوتووە جگە لەوەش ئارامی و نەبەزی بۆ جێماوە، وەهاوڕێکەشی هەر بۆماوەتەوە.

لەپاشان پێی ووت:ئەوەبۆچی وەستاوی وەك لەدڵی خۆتا قسەبکەی وایە؟ ووتی: لەبەر ئەوەیە کەژنەکەم نەخۆشە و ئەترسم کەبەتەواوی نەتوانم پاداشتی چاکەتان بدەمەوە.

مەیمونەکە ووتی: خەفەت مەخۆ، چونکە کەڵکی نییە لەجیاتی ئەوە کەخەفەت ئەخۆی چارەو دەرمان بۆژنەکەت بدۆزەرەوە چونکە پێشینان ووتوویانە: خاوەنی سامان ئەبێ لەچوار شتدا سامانی خەرج بکا: لەچاکە کردن، لەکاتی پێویستی، بۆکوڕان وەبۆ ژنانی خۆی. کیسەڵەکە ووتی: ڕاست ئەکەی پزیشکان ووتوویانە دەرمانی نییە (دڵی مەیمون) نەبێ.

مەیمونەکە لەدڵی خۆیدا ووتی: داخەکەم بەم پیرییە بەهۆی چاو برسێتی وتێرنەخواردنەوە کەوتومەتە گەورەترینی گیرو گرفتەوە، بەخوا ئەو کەسە ڕاستی کردووە کە ئەڵێ: مرۆڤی چاوتێر لەخۆشیو کامەرانیدایە، بەڵام چاوبرسی هەمیشە لەسزاوئازارو نەگبەتیدا ئەتلێتەوە. ئێستا من پێویستیم بەمێشکم هەیە بۆڕزگاربوونم لەم گیرو گرفتە.

لەپاشا بەکیسەڵەکەی ووت: بۆچی دەنگت نەکرد کەلەماڵەوە بووم هەتا دڵەکەم لەگەڵ خۆمدا بۆ بهێنایتایە؟ ئێمەی مەیمون ڕەوشتمان وایە کەبەمیوانی چووین بۆماڵێك دڵمان لەماڵەوە بەجێ دێڵین لەبەر ئەوەی ئەگەر سەیری خێزانی ماڵکەمان کرد دڵمان پێ نییە. کیسەڵ ووتی: ئێستە تۆدڵت لەکوێ داناوە؟ ووتی لەسەردارەکە بەجێم هێشت. ئەگەر ئارەزوو ئەکەی ئەچین ئەیهێنین. کیسەڵەکە لەدڵی خۆیدا ووتی: هاوڕێکەم بێ ئەوەی ناپاکی دەربارە بکەم دڵەکەی دامێ وەلەخۆشیاندا دەست بەجێ مەیمونەکەی هێنایەوە قەراخی ڕووبارەکە. (مەیموون)

بازی داو بەدارەکەدا هەڵگەڕا ئیتر نەهاتەوە. کیسەڵ بانگی کرد: هاوڕێ خێراکە دڵەکەت بیرنەچێ. مەیموونەکە ووتی: بڕۆ وائەزانی منیش ئەو کەرەم کەچەقەڵ پێی ووت: دڵ و گوێی نییە؟ کیسەڵەکە ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ مەیموون ووتی: ئەگێڕنەوە (شێرێك) لەدارستانێکدا ئەژیا (چەقەڵێکی) لەگەڵدابوو کەلەپاشماوەی ئەخوارد شێرەکە نەخۆش کەوت ئیتر ڕاوی بۆنەئەکرا. بەچەقەڵەکەی ووت: ئەم نەخۆشیەی من دەرمانی نییە دڵ و گوێی (کەر) نەبێ. (چەقەڵ) ووتی: ئەو دەرمانە چەند ئاسانە لەشوێنێکدا کەرێك هەیە بۆتی ئەهێنم بیکوژە. چووە لای کەرو پێی ووت: بۆچی وا لەڕو لاواز بەتەنیا ئەگەڕێی؟

کەرەکە ووتی: خاوەنەکەم ئالیکم ناداتێ وەبچمە هەرلایەك ئادەمیزاد ماندووم ئەکاو تووشی سزاو برسێتی ئەبم. چەقەڵ ووتی: شوێنێك هەیە لەوەرگای زۆرە کۆمەڵێك کەری تریش هەروەك تۆ لەوێدا بێ خاوەن ئەسوڕێنەوە هەموو قەڵەوو بەدەماخن وەرە لەگەڵ مندا ئەتبەم بۆناو ئەوان.

چەقەڵ کەرەکەی بردە بەردەمی شێرەکە، شێر پەلاماری دایە، بەڵام لەبەر نەخۆشی و لاوازی خۆی نەیتوانی کەبیکوژێ .

کەرەکە بەڕاکردن بۆی دەرچوو بەترسێکی گەورەوە ڕزگاری بوو. چەقەڵ بەشێرەکەی ووت: ئەی گەورەی گیانەوەر ئەوەندە بەم جۆرە لاوازو کەم هێز بویت؟ (شێر) ووتی: ئەم جارە ئەگەر بێتەوە لەدەستم دەرناچێ. (چەقەڵ) دووبارە چووەوە بۆلای و پێی ووت: ئەوە لەترسی

چی ڕاتکرد؟ خۆئەوە یەکێك بوو لەکەرەکان هات بەپیرتەوە کەپێشکەش بەهاوڕێکانیت بکا. کەرەکە باوەڕیکرد، چونکە هەرگیز شێری نەدی بوو هەستاو لەگەڵ چەقەڵدا چونەوە بۆناو دارستانەکە (چەقەڵ) زوو خۆی کرد بەلانەی شێرەکەداو پێی ووت: ئاگات لەخۆت بێ ئەم جارە ئەگەر لەدەستت ڕزگاری بوو جارێکی تر نایەتەوە. شێرەکە لەو قسەیە دەرووني گەرم بوو لەلانەکەی هاتە دەرێ و پەلاماری کەرەکەی داو تێکی شکاند. لەپاشا ووتی: پزیشکەکان ووتوویانە، خۆراك نابێ بخورێ هەتادەستودەم پاك نەشۆررێ، ئێستەدێمەوە دڵوگوێچکەکانی ئەخۆمو ئەوی تری هەمووی بۆتۆ. شێرەکە چوو بۆدەست شتن. چەقەڵەکە دڵ و گوێچکەکانی کەرەکەی خوارد بۆئەوەی کەشێرەکە بێزی لێ بکاتەوەو هیچی لێ نەخوا. کەشێرەکە هاتەوە، سەیریکردو بەچەقەڵەکەی ووت: دڵ و گوێچکەی ئەم کەرە لەکوێ یە؟ چەقەڵەکە ووتی:

ئەم کەرە دڵ و گوێی نییە. ئەگەر دڵی ببوایە پێی تێ بگا وەگوێی ببوایە کەقسەی پێ وەر بگرێ جارێکی تر نەهاتەوە بۆلای تۆ لەپاش ئەوەی کەلەمردن ڕزگاری بوو. لەبەر ئەوە ئەم پەندەم بۆووتی: کەبزانی منیش ئەوکەرەنیم کەچەقەڵ پێی ووت ئەم کەرە دڵ و گوێی نییە، بەڵام تۆ فێڵت لێ کردم و تەفرەت دام، منیش فێڵم لێ کردی و تەفرەم دای، وەزانیم کەکارم لێ گۆڕاوە.

زاناکان ووتوویانە: ئەوەی نەزانی تێکی ئەدا زانایی رێکی ئەخا.

کیسەڵەکە ووتی: ڕاست ئەکەی، بەڵام پیاوی چاك پێ لەگوناهی ئەنێ، وەئەگەر هەڵەیەکی کرد تەمێ خوار ئەبێ و هیچ شەرم ناکا، چونکە قسەو کرداری ڕاستن. وەئەگەر کەوتە ناو گێرو گرفتێکەوە ئەتوانێ بەزانین و چارە خۆی ڕزگار بکا وەك ئەو پیاوەی کەئەکەوێتە سەرزەوی هەربەزەوییەکە خۆی ڕاست ئەکاتەوە .

ئەمە پەندی ئەو پیاوەیە کەبەشوێن پێویستیدا ئەگەڕێ وەکەدەستی کەوت لەکیسی خۆی ئەدا.

## دەرگای (مەیمون و کیسەڵ)

## تەواو بوو

# دەرگـــــای
# {خواپەرست} و {سمۆرە}



(دەبشەلیم) پادشای هیند ووتی بە (بەیدەبای فەیلە سووف) ئەو پەندەم بیست ئێستە پەندی (پیاوی هەڵەشەم) بۆ بڵێ کەلەکاروباردا پەلە ئەکا بەبێ ووردبونەوە لە ئەنجامی کار.

فەیلەسوفەکە ووتی: ئەوەی لەئیشدا پەلەبکاو ئارامی نەبێ هەمیشە پەشیمانە، وەئەوەی بەسەردادێت کەبەسەر خواپەرستەکەدا هات لەکوشتنی سمۆرەدا کەدڵسۆزی ئەوبوو، پادشا ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ فەیلەسوفەکە ووتی:

ئەگێڕنەوە لەخاکی (جورجان[1]) خوا پەرستێك هەبوو، چەند ساڵ ژنەکەی منالی نەئەبوو، لەپاش وەڕەس بوون ژنەکە سکی پڕبوو. خوا پەرستەکە سوپاسی خوای کردو لەپاشا بەژنەکەی ووت: مژدەبێ هیوام هەیە کەسکەکەت کوڕبێ، وەسودمان پێبگەیەنێ هەرلەئێستاوە جوانترینی ناوی بۆ ئەدۆزمەوە و کۆمەڵێ زانایانی بۆ بانگ ئەکەم. ژنەکە ووتی: پەلە مەکە کابرا تۆ لەخۆتەوە بۆچی قسە لە کارێك ئەکەی کە هێشتا نەبووە؟ هەرکەسێ ئەوە بکات ئەوکارەساتەی بەسەردادێت کە بەسەر (خواپەرستەکەدا)هات کەڕۆن و هەنگوینی بەسەردا ڕژا. (خواپەرستەکە)ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ ژنەکە ووتی: ئەگێڕنەوە (خواپەرستێك) لە ماڵی دەوڵەمەندێکەوە هەموو ڕۆژێك هەنگوین و ڕۆنی بۆ ئەچێ ئەیش لێی ئەخواو، ئەویشی ئەمێنێتەو لە کوپەیەکدا هەڵی ئەواسێ هەتا پڕ ئەبێ.

ڕۆژێك کە لەسەر پشت لێی کەوتووەو گۆچان بەدەستەوەو بیرلە گرانی ڕۆن و هەنگوین ئەکاتەوە. لە دڵی خۆیدا ئەڵێ بەیانی ئەم کوپەڵە هەنگوین و ڕۆنە ئەفرۆشم بە لیرەیەك وە(دە) بزنی پێ ئەکرم ئەوانیش هەموو پێنج مانگێك سکێك ئەزێن. زۆری پێ ناچی بزنێکی زۆرم ئەبێ، کارژۆڵەکانیش گەورە ئەبن و ئەزێن بەمجۆرە لەپاش چەند ساڵێك زیاتر

---

[1] جورجان – شارێکە لەئێران

لە (چوارسەد) سەر بزنم ئەبێ. بەمانە (سەد) مانگا ئەکڕم. هەر (چوار) بزن ئەدەم بە (یەك) مانگا یان بە(یەك) گا. لەپاشا زەوی و تۆو ئەکڕم وەجوتیار بەکرێ ئەگرم. بەگاکان جوتکردن، وە لە مانگاکان بەروبوم و شیرو کەرەو ڕۆن وەرئەگرم. هەمووی پێنج ساڵ نابا پارەیەکی زۆرم دەس ئەکەوێ. کۆشکێکی نایاب ڕائەکێشم و کارەکەرو نۆکەری زۆر ڕائەگرم، وەژنێکی جوانی لێ دێنم ئەویش کوڕێکی جوانی ئەبێ جوانترینی ناوی بۆ ئەدۆزمەوە کە گەورە بوو خۆم پەروەردەی ئەکەم، وەهەمیشە ئامۆژگاری ئەکەم، ئەگەر بەقسەی کردم باشە ئەگینا بەم گۆچانە لێی ئەدەم گۆچانەکەی بەتوندی هەڵبڕی کەوت لە کوپەڵەکەو شکاندی. ڕۆن و هەنگوین هەمووی بەسەرو ڕیش و جلەکانیدا هاتە خوارێ.

لەبەر ئەوە ئەم پەندەم بۆ ووتی کەپەلە نەکەی لەکارێکدا کە ئەنجامی نازانی. خواپەرستەکە بەقسەی ژنەکەی بێدەنگ بوو. لەپاشان کوڕیان بوو، باوکی زۆری خۆش ئەویست لەدوای چەند ڕۆژێك کاتی بڕینی[1] هات. ژنەکە چووبۆ (گەرماو[1] ) کابراش لای کوڕەکە بوو. زۆری پێ نەچوو پیاوێك لەلایەن پادشاوە هات ووتی:

من نێرراوم پادشا ئەیەوێ بچیتە لای. کەس لەماڵەکەدا نەبوو، (سمۆرەیەك) نەبێ هەرلەمناڵییەوە هاوڕێی مناڵەکە بوو.

(خواپەرست)دەرگای لەسەر داخستن و چوو بۆلای پادشا لە دیواری ژورەکەوە مارێك هاتەدەرێ، وەلەکوڕەکە نزیك بوەوە. سمۆرەکە

---

(١) بڕین – خەتەنە

(٢) گەرماو – حەمام

پەلاماری دایەو پارچەپارچەی کرد. لەوکاتەدا خواپەرستەکە دەرگاکەی هەڵگرت. سمۆرەکە چوو بەپیریەوە وەکو مژدەی بداتێ کەکورەکەی لە مردن ڕزگارکردووە. کەخوا پەرست سمۆرەی بەوجۆرەدی کە شڵەژاوەو هەموو دەموو چاوی خوێناوییە، هۆشی لەسەردا نەما، وایزانی کەکورەکەی خنکاندووە. ئارامی نەگرت هەتا ڕاستی کارەساتی بۆ دەرئەکەوێ. دارێکی کێشا بەسەری سمۆرەکەداو کوشتی، کە هاتە ژورێ سەیری کرد کورەکەی ساق و زیندووە، وە مارێك لە نزیکیەوە کوژراوە. ئینجا تێگەیشت کەوا گوناهێکی گەورەی کرد بەهۆی هەڵەشەیی و پەلەوە. بە هەردوو چەپۆك دای بەسەری خۆیداو ووتی:

خۆزگە ئەم کوڕەم هەرنەبووایە، وەئەم گوناهەم نەکردایە. لەو کاتەدا ژنەکەی هاتەوەو سەرگوزشتەی چاکی سمۆرەکەو پاداشی خراپی خۆی بۆ گێڕایەوە. ژنەکەی ووتی: ئەمە بەری هەڵەشەیی و پەلەیە.

ئەمە پەندی ئەوکەسەیە کە لە کارو باریدا خۆی پێ ڕاناگیرێ، وە کارو مەرامی خۆی بە هەڵەشەیی و پەلەپەل ئەکا.

******

**دەرگای (خواپەرست و سمۆرە) تەواو بوو**

# دەرگـــــای

## ( مشـــــك ) و ( پشـــــیلە )



(دبشەلیم) پادشای هیند ووتی بە(بەیدەبای فەیلەسوف): ئەم پەندەم بیست، ئێستا پەندی ئەو پیاوەم بۆ باسبکە کە دوژمن لە هەموو لایەکەوە دەورەیان داوە، کە لەناوی ببەن، ئەویش بە چاکەکردن و ڕێککەوتن لەگەڵ هەندێکیاندا خۆی ڕزگار ئەکا، لەپاشا وازیان لێدێنێ و لێیان دوور ئەکەوێتەوە. فەیلەسوفەکە ووتی: دۆستی و دوژمنایەتی لەسەر بارێك ڕاناوەستن، دورنییە کە دۆستایەتی لە ئەنجامدا بگۆڕێ بۆ ناحەزی و دوژمنایەتی، وە دوژمنایەتی ببێ بە دۆستی و خۆشەویستی. بۆ ئەمەش چەند تاقیکردنەوەو ڕوداو هەیە.

پیاوی ژیر لەگەڵ هەموو ڕووداوێکی تازەدا ڕایەت وئەگونجێ. لەگەڵ دوژمندا بەدوژمنایەتی و نەبەردی، وە لەگەڵ دۆستدا بە نەرمی و چاکە کردن. لەگەڵ ئەوەشدا پیاوی ژیر جاری وا هەیە دوژمنی لە خۆی نزیك ئەکاتەوە، وەڕێزی لێ ئەگرێ، لەکاتی ترس و تەنگ و چەڵەمەدا. هەتا ڕزگاری ئەبێ. هەر کەسێك بەو جۆرە جوڵایەوە، بە ئازایی سەر ئەکەوێ و ئەگا بە ئامانجی خۆی. ئەمەش وەکو سەر گوزشتەی (مشك و پشیلە)، کە هەردووکیان ژیانیان لەمەترسیدابوو، بەڵام بە چاکەکردن و ڕێککەوتن لەگەڵ یەکتردا ڕزگاریان بوو. پادشاکە ووتی: ئەوە چۆن بووە؟

(بەیدەبا) ووتی: ئەگێڕنەوە دارێکی گەورە هەبوو، لە بنکیدا کونی پشیلەیەك هەبوو کە پێیان ئەووت (ڕۆمی) وە لەنزیك ئەوەوە کونی مشکێك هەبوو کە پێیان ئەووت: (فەرەیدوون). ڕۆژێك مشکەکە چووە دەرەوە سەیریکرد پشیلەکە لەناو تۆڕی ڕاوکەرێکدایە. زۆری پێ خۆش بوو. بەڵام کە ئاوڕی دایەوە لە دوایەوە(سمۆرەیەك) وەستابوو، سەیری سەرەوەی کرد (کونە پەپوویەك) لەسەردارەکە هەڵنیشتووە. مشکەکە زۆر ترسا: ئەگەڕێتەوە دواوە سمۆرەکە ئەیخوا، ئەگەر بەلای ڕاست، یان چەپدا ئەڕوا، (کونە پەپوو) ئەی ڕفێنێ، ئەگەر ئەچێتە پێشەوە پشیلەکە لە تۆڕەکەدا ئەیخوا. ووتی: ئەمە کارەساتێکی گەورەیە، بەڵام مرۆڤی ژیر هەرگیز ناترسێ، چونکە ژیری وەك دەریای بێ بن وایە، کۆتایی نییە. کارەسات و ڕوداو کار لەژیری ناکەن وەسەرکەوتن شادو سەرخۆشی ناکاو سەری لێ تێك نادا. من ئێستە لەگەڵ ئەم پشیلەیەدا ڕێك نەکەوم، ڕزگارم نابێ لەمردن.

چونکە ئەویش وەك من مانەوەی لەمەترسی دایە. مشکەکە بە پشیلەکەی ووت: ، ئەگەر ڕێگام ئەکەی، وە دڵنیام ئەکەی پەتەکانت ئەقرتێنم وەبەمە هەردوکمان ڕزگارئەبین، وەك کەشتی و مەلەوانەکانی کەشتیەکە بەوان و ئەوان بەو ڕزگار ئەبن لەمەترسی دەریا.

پشیلەکە ووتی: قسەت وەك ڕاست بێ وایە ئەگەر تۆ ئەوکارەم لەگەڵدا بکەی هەتا ماوم سوپاست ئەکەم. مشکەکە ووتی ئەوا لێت نزیك ئەبمەوە، گشت پەتەکانت ئەقرتێنم، تەنها یەکێکیان نەبێ، کەئەویش خۆمی پێ لەتۆ ئەپارێزم، لەپاشا دەستی کرد بەقرتاندنی پەتەکانی پشیلە. کاتێ (کەسمۆرەو) (کونەپەپوو) ئەوەیان دی هیوایان بەمشکەکە نەما و ڕۆیشتن. مشکەکە بەسستی پەتەکانی قرتاند. پشیلەکە ووتی:

کوانێ پەیمانەکەت؟ ئەمەکاری پیاوچاك نییە. پیاوی چاك هەرگیز ڕقەبەری ناکا، وەتەنها تۆزێك لەچاکە گەلێك خراپەی لەبیر ئەباتەوە. زاناکان ووتوویانە: ناپاك زوو سزای ناپاکی خۆی وەر ئەگرێ، وەلێخۆشبوون بۆئەو نییە. بەتایبەتی ناپاکی لەگەڵ هاوڕێدا. مشکەکە ووتی: هاوڕێ دووجۆرن: (دڵسۆز) و (ناچار). هاوڕێی (دڵسۆز) هەمیشە پەنای بۆئەبرێ، وەمرۆڤ لێی دڵنیان، بەڵام (ناچار) پیاوی ژیر لەکاتی سەختیدا کاری خۆی پێ جێبەجێ ئەکا، وەهندێك جاری تر خۆی لێ ئەپارێزێ. وەئەوەی کەئەچێتە لای لەبەر ئامانجێکی تایبەتی یان کارێکی پەلەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر خۆی لێ ئەپارێزێ. وە بزانە

هەموو ئیشێك كاتی خۆی هەیە، وەلەكاتی خۆیدا نەبێ ئەنجامی باش نابێ. من ئەو كاتە پەتەكانت بەتەواوی ئەقرتێنم كەبزانم ئاگات لەمن نییەو بەكاری خۆتەوە خەریكی، لەوقسانەدابوون ڕاوكەرەكە دەركەوت. پشیلەكە ووتی: گیانەكەم ئێستە هەوڵ بدە پەتەكانم بقرتێنە. مشكەكە بەچالاكی هەموو پەتەكانی قرتاند، پشیلەكە لەترسی ڕاوكەرەكە بازی دایە سەر دارەكە، مشكەكەش خۆی كرد بەكونێكدا. ڕاوكەری هەژار بەداماوی پەتە بچڕاوەكانی هەڵگرت و ڕۆیشت.

لەپاشا مشكەكە لەپشیلەكە دوركەوتەوە. پشیلەكە بانگی كرد ئەی هاوڕێی خۆشەویست بۆچی نزیك نابیتەوە هەتاپاداشتی چاكەت بدەمەوە، تۆبزانە ئەوەی هاوڕێیەك پەیدا بكا، وەلەدواییدا وازی لێ بێنێ بەری هاوڕێیەتی نابینێ، وە برادەران سودی لێ نابینن. مشكەكە ووتی: لەوانەیە دۆستایەتییەكی سەرزارەكی لەژێرەوە دوژمنایەتی شاراوەی لەناودابێ كەبەهێزترە لەدوژمنایەتی ئاشكرا، وەئەوەی خۆی لەوە نەپارێزێ وەك ئەو پیاوەی بەسەردادێت كەسواری كەڵبەی (فیلی شێت)ئەبێ لەپاشان خەو ئەیباتەوە، كاتێك ئاگادار ئەبێ كەلەژێرپێیدا ڕاكشاوە، فیلەكەبەسەریا ئەڕواو ئەیكوژێ، مرۆڤی ژیر لەبەر سوودی خۆی دۆستایەتی خۆی نیشانی هاوڕێ ئەدات ئەگەرمەترسی زیانی لێ بكات.

(گیانەوەری بێ زمان) شوێنی دایكی ئەكەوێ لەبەر شیرەكەی وەكەئەوەی نەما وازی لێ دێنێ. دوورنیە كەهاوڕێیان ناكۆكی

لەناویاندا ڕوووبدات وەهیچ لەیەکتریش نەترسن، چونکە بنچینەی کاریان دوژمنایەتی نەبووە. بەڵام ئەوەی کەهەر لەبناغەوە دوژمنایە تیەکی پەتی لەگەڵ کەسێکدا هەبووبێ، وە لەبەر کارێك دوستایەتییەك نیشان بدا. لەگەڵ نەمانی کارەکەدا دۆستایەتییەکەش ون ئەبێ، هەروەکو ئاو کەبەئاگر گەرم ئەبێ، وەکەئاگرەکە نەما ئەگەڕێتەوە بۆدۆخی جارانی و سارد ئەبێتەوە.

تۆ گەورەترین دوژمنی بەرامبەر بەمن، لەبەر پێویستیەك ناچاربووم لەگەڵتدارێککەوتم ئێستاپێویستیەکە نەماوە ئەترسم دوژمنایەتیەکەمان تازە بوبێتەوە، بۆ بێدەستەڵات باش نیە کەلە دوژمنی بەهێز نزیك بێت.

نازانم تۆکارت بەمن چیە ئەوەنەبێت کەبمخۆی؟ زاناکان ووتوویانە: ئەو هەژارەی کەخۆی لەدوژمنی بەهێز ئەپارێزێ لەڕزگارییەوە زۆر نزیکترە لەکەسێکی خاوەن دەسەڵات کەبەدوژمنی هەژار لەخۆی بایی ئەبێ و هاتوچۆی ئەکا. مرۆڤی ژیر لەکاتی ناچاریدا لەگەڵ دوژمن ڕێك ئەکەوێ وەکەهیچ چارەی نەما ئەچێتە لای، لەپاشا کەهەلی دەست کەوت خێرا لێی دور ئەکەوێتەوە. ئەوکەسانە دورن لەکەوتنەوە. پیاوی ژیرو زانا پەیمانی ئاشتی و ڕێککەوتن لەگەڵ دوژمنیدا ئەباتە سەر، بەڵام هەرگیز بەتەواوی باوەڕی پێ ناکا، وەهەرچەندە کەخۆی لێ نزیك بکاتەوە هەرلێی ئەترسێ، وەلەسەری پێویستە هەتا ئەتوانێ لێی دوربێ، منیش وا لەدورەوە ماڵ ئاواییت لێ ئەکەم کەهەر خۆش بی

وەنامەوێ کەچاکەم لەگەڵدا بکەیت بەپێی کارم نەبێ، ئیتر پێویست ناکات بەیەکەوە دابنیشین.

برۆر خوات لەگەڵ .

******

-دەرگای (مشک و پشیلە) تەواو بوو-

# دەرگـــــــای

# -کوڕە پادشـــاو باڵـــــندە-



(دەبشەلیم)پادشای هیند ووتی:بە(بەیدەبای فەیلەسوف) ئەوپەندەم بیست ئێستا پەندی (تۆڵەسێنانم) بۆبڵێ، کەپێویستە خۆیان لەیەکتر بپارێزن. (بەیدەبا) ووتی:

ئەگێڕنەوە یەکێك لەپادشاکانی هیند کەناوی(فەرەیدون)بوو، باڵندەیەکی هەبوو پێیان ئەووت (فەنزا). ئەم باڵندەیە بەچکەیەکی هەبوو، وەکو ئادمیزاد قسەیان ئەکرد، پادشا زۆر سەری سوڕما بوو لێیان. ژنی پادشا کوڕێکی بوو، لەگەڵ بەچکەکەدا هۆگری یەك بوون، وەهەمیشە بەیەکەوە یارییان ئەکرد لەبەر ئەوە پادشا زۆری خۆش ئەویستن. ڕۆژێك کەبەیەکەوە یارییان ئەکرد، بەچکەکە ڕیقنەی کرد بەجلەکانیا. منداڵەکە تووڕەبوو دای بەزەویداو کوشتی. کە "فەنزا" هاتەوەو ئەو کارەساتەی دی. هاواری کرد ووتی: هاوار بۆ ئەو کەسەی کەئەبێتە دۆستی پادشایان کەچاکەو پەیمانیان بەلاوەنیە لەکاتی کارو پێویستیدا نەبێ، ئیشیان لەسەر پاکانەو درۆدامەزراوە تاوانی گەورە ئەکەنو بەپچووك ئەیدەنەقەڵەم لەسەر ئارەزوو ڕابواردنییان، وەکاری بچووك گەورە ئەکەن وە هەژاران قڕ ئەکەن، لەبەر سودو مانەوەی خۆیان. لەپاشا (فەنزا) پەلاماری کوڕەپادشای داو بەدەنووك هەردو چاوی کوێرکرد، لەپاشا فڕی و بەسەر تەلاری کۆشکەکەوە نیشتەوە.

کاتێك پادشا بەوەی زانی ئارامی لانەما، بڕیاریدا کەبەفێڵ بیگرێ. لەنزیکییەوە ڕاوەستاو بانگی کرد. وەرە خوارێ ئەی(فەنزا) وا لێتخۆش بووم.

(فەنزا) ووتی: ئەی پادشا مرۆڤی ناپاك سزای خۆی هەر وەرئەگرێ، بەجۆرێك لەوانەیە کە کوڕوکوڕەزاشی ئەگرێتەوە .

کوڕەکەی تۆ ناپاکی لەگەڵ بەچکەکەی مندا کردووە منیش زووسزامدا. پادشا ووتی:

بەخوا ناپاکیمانکرد تۆش تۆڵەی خۆتت لێ سەندین، ئیتر وەرە خوارێ با بەخۆشی ڕابوێرین، چونکە ماف لەسەر هیچ لامان نەماوە (فەنزا) ووتی: من جارێکی ترنایەمەوە بۆلای تۆ، چونکە زاناکان هەرگیز ڕێیان نەداوە کەکەسێك لەخاوەن کوژراوێکەوە نزیکبێ کەهێشتا تۆڵەی لێوەرنەگرتبێ یان مافی لێ دەستگیر نەبوبێ، هەرچەندە خاوەن کوژراو قسەی نەرم بێت یان خۆی بەچاك نیشانی خوێنرێژ بدا، ئەبێ زیاتر لێی بترسێ و دڵی لێ پیس بکا. چاکترین شت بۆتۆ کە خۆت لەخاوەن کوژراو بپارێزی ئەوەیە کەلێی دووربێت و لەهەڵمەت و فێڵی بترسی. زاناکان ووتوویانە: مرۆڤی ژیر باوکو دایکی خۆی بە(برادەر) سەیر ئەکا هەروەها براکانی بە(هاوڕێ)و وەژنی بە(هۆگر) وەکوڕانی بە(یادکەرەوەی خۆی) وەکچانی بە(دوژمن) وەخزمانی بە(دۆست) وەخۆی بە(تەنهاو بێ کەس) دائەنێ. منیش تەنهاو بێ کەسم، بارێکی قورسم لەخەفەت لەلای ئێوە دەست کەوت کەکەس لەگەڵم هەڵناگرێ بڕۆ خوات لەگەڵ. پادشاووتی: ئەگەر تۆڵەی خۆتت لێ نەسەندینایەو لەپێشا تۆخراپەت دەربارەی ئێمە بکردایە وابوو، بەڵام کەئێمە لەپێشا خراپەمان دەربارەی تۆکردبێ گوناهی تۆچییەو لەچی ئەترسی؟. (فەنزا) ووتی: بزانە کەزمان ناتوانێ هەموو کاتێ ڕاستی ناو دڵ دەربخات. دڵ چاکتر لەدڵ ئەزانێ نەك زمان. خۆت

ئەزانی کەدڵم قسەی تۆ ڕوونناکاتەوە، دڵی تۆش هەروایە. پادشا ووتی: ڕق و کینە لای هەمووکەس هەیە، بەڵام مرۆڤی تێگەیشتوو پەروەردەی ناکا بەڵکو هەتا بتوانێ لەناوی ئەبا. (فەنزا) ووتی: ڕاست ئەکەی، بەڵام لەگەڵ ئەوشدا بزانە کەخاوەن کوژراوی ڕقاوی هەرگیز بەسەرهاتی لەبیرناچێتەوە و ڕقی لە دڵدا هەرئەمێنێ دەربارەی خوێنڕێژ. پیاوی ژیرو دانا هەرگیز لەفێڵ‌وپیلانی دڵنیا نییە وە ئەزانێ کەگەلێك دوژمن بەزۆرە ملێ ناگیرێن هەروەك بەنەرمی ڕاو ئەکرێن. وەکو فیلی دڕندەی کێو کەبەفیلی ماڵی ڕاوئەکرێ و دێتە ژێر بار. پیاوی زانا هەرگیز لەدۆست و برادەر وەڕەس نابێ هەرچەندە کەلەخۆشی ئەترسێ، وەئەم جۆرە خووە لەنزمکترینی گیانەوەرانیشدا هەیە.

هەروەکو چاوم پێ کەوتووە (یاری کەران) یاری بەسەگ ئەکەن وەلەپاشا[1] سەری ئەبڕن و ئەیخۆن. لەگەڵ ئەوەشدا سەگی تریان پێیە، چاوی بەوە ئەکەوێ، بەڵام هەر لەگەڵیان ئەگەڕێ و لێیان جوێ نابێتەوە (فەنزا) ووتی: ڕق لەهەموو شوێنێکدا ترسناکە، بەتایبەتی لای پادشایان کەبەسزای زۆرترسناك تۆڵە ئەسێنن، وەکوشتن، لای ئەوان گەورەیی‌وسەربەرزییە. پیاوی ژیر هەرگیز بەوەستانی ڕق هەڵناخەڵەتێ. چونکە ڕق کەچارەی نەبوو وەك (پشکۆی شاراوە) وایە کەسوتەمەنی لێوەدورە وەچاوەڕوانی هەلێکە کەبۆی هەڵکەوت وەك

[1] لەولاتی چین ئەم خووە بەزۆری هەیە، سەگی گەورە پەردە ئەکەن وەبۆ خواردن بەکاریان دێنن.

وەرگێڕ

ئاگر کڵپە ئەسێنێ و ئەڕوا. نە قسەی خۆش، وەنەپاڕانەوە، نەپاکانە، هیچ شتێك ناکوژێنێتەوە جگە لەکوشتارو لەناو بردنی ژیان. لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە کەکەسێکی خوێنڕێژی زۆردار جارێکی تر چاوەڕوانی گەڕانەوە بکات بۆلای خاوەن کوژراو بەهۆی سامان و پارمەتییەوە، بەڵام من ناتوانم کارێکی وابکەم کەڕق و کینە لەدڵی تۆدا نەمێنێ بەرامبەر بەمن، وەهەرچەندە گیانت بەدەستی منەوە بێ وەك تۆ ئەڵێی من هەرلە (ترس) و (دوودڵی)دا ئەبم، وەهیچ چارەمان نییە جیابوونەوە نەبێ. پادشا ووتی: هەموو شتێك لەسوودو زیان وە لەگەورە هەتا بچووك هەمووکاری ڕۆژگارن.

دروستبوونی جیهان و ژیانی زیندەوەر و هاتن و لەناو چوونی هەمو گیانلەبەرێك وەگەڕانی هەمووئەستێرەی ئاسمان و مانەوەی زەوی هەمووی بەدەست ئەوە.

ئەو کارەساتەی نێوانی ئێمە و ئێوەش هەرلەبناغەی کارەوە (ڕوژگار) بڕیاری داوە، من و تۆش هەردوکمان کاری دەستی ئەوین، بە ئارەزووی خۆی ئەمانگێڕێ، ئیتر نابێ گوێ بدەینە ئەمجۆرە کارانەی کەئەو بۆی داناوین.

(فەنزا) ووتی: ڕۆژگار وەك تۆ ئەڵێی وایە، بەڵام مرۆڤی زیرەکی تێگەیشتوو خۆی لەخراپە هەر ئەپارێزێ و باوەڕی بەڕۆژگاریش هەیە، بەڵام ڕێگای ڕزگاربوون و خۆپاراستن و نەبەردی و کۆشش بەر نادا. من ئەزانم کەقسەکانت دورن لەڕاستییەوە، وەکاری نێوانی من و تۆ هەر

وابچووك نییە،چونکە کوڕەکەت بەچکەی منی کوشتووە و منیش چاوی کوڕەی تۆم کوێرکردووە. ئیستا تۆ ئەتەوێ بەفێڵ بمکوژی و گیانیش مردنی ناوێ و ژیان حەز لەمانەوە ئەکا. زاناکان ووتوویانە: گرانی بەڵایە.

هەروەهاپیری، نەخۆشی، خەفەت، نزیکی دوژمن، دوری دۆست ئەمانە گشتییان بەڵان، وەسەری هەموو بەڵایەکیش مردنە. هیچ کەس لەدڵی داماوی دڵ بریندار نازانێ وەك ئەوەی کە سزاو خەفەتی چێشتووە. من بەهۆی دڵی خۆمەوە لەدڵی تۆ چاك ئەزانم. پادشا ووتی: ئەوکەسە بەکارنایە کەناتوانێ بەسەر ڕقی خۆیدا زاڵ ببێ، وەهەرگیز یادی نەکاتەوە.

(فەنزا) ووتی: ئەوکەسەی کەژێری پێی بریندارە هەر چەند کەسوربێ لەسەر ڕۆیشتن هەر سکاڵا ئەکاو پەرێشانە بەدەست ئازاری کولانەوەی برینییەوە. وەئەوەی کە چاوی دێشێ ئەگەر بیداتە بەر(ڕەشەبا) زیاتر توشی ئێش و ئازاری ئەکا. بەو جۆرەش (خوێنڕێژ) هەتا لە (خاوەن کوژراو) نزیکتر بێ زووتر خۆی ئەدا بەکوشت، لەبەر ئەوە لەسەر پیاوی ژیر پێویستە کەخۆی لەگیرو گرفت بپارێزێ، وەکاری خۆی لێکبداتەوە ، تەنها پشت بەهێزو دەستەڵاتی خۆی نەبەستێ.

وەبە قسەی کەسانی ناپاك خۆی نەخاتە گێژاوی ترسەوە. چونکە ئەوەی کەپشتی بەئازایی و هەوڵدانی خۆی بەتەنها ببەستێ وای لێ دێ کەرێگەی ترسناك بگرێتە بەر، وەلەئەنجامدا خۆی لەناو ئەبات.

وەئەوەی کەرێگای تەواو بۆخواردن و خواردنەوەی دانەنێ وە ئەندازەی ژیانی خۆی نەزانێ و لەسنوری خۆی بیباتە دەرەوە، وە(پاروو) بەئەندازەی دەمی رێکنەخات تووشی گیروو گرفت و لەناوچوون ئەبێ. وەئەوەی کەبەقسەی دوژمن دەسخەرۆ ببێ، دوژمنی گیانی خۆیەتی، کەسنازانی کاری (رۆژگار) چۆنەو وەچی دێنێ و چی دەبا، بەلام پێویستە کەپیاو کۆڵ نەدا، وەبە ئازایەتی و دەروون بەرزی کاری خۆی بکاو ئاگای لەخۆی بێ، مرۆڤی ژیر هەتابتوانێ باوەڕ بەکەس ناکا وەئەگەر شوێنی رزگاربوونی دەست کەوت لەناو ترس و ناخۆشیدا نامێنێتەوە. زاناکان ووتوویانە: (پێنج) رەوشت هەیە کەلەهەرسێکدا هەبێ پەکی ناکەوێ:

یەکەمیان: (ئازارنەدانی هیچ زیندەوەرێك)،

دووەم: (هەستان و دانیشتنی جوان)،

سێ یەم: (دورکەوتنەوە لەشوێنی خراپ)،

چوارەم: (رەوشتی باش)،

پێنجەم: (دەست پاکی و راستی لەئیش و کاردا).

وەئەگەر کەسێك ژیانی کەوتە مەترسییەوە واز لەماڵ و نیشتیمان و خێزان و هەمووشتێك دێنێ، وەهیوای هەیە کە لەپاشەرۆژدا ئەوانەی

دەست بکەوێتەوە، بەلام کەخۆی لەناوچوو جارێکی تر ژیانی بۆ ناگەڕێتەوە. خراپترینی سامان ئەوەیە کەلێی خەرج نەکرێ، وەخراپترینی ژن ئەوەیە کەگوێ لەقسەی مێردی ناگرێ، وەخراپترینی کوڕ ئەوەیە کەچاکەی دایك و باوکی لەبەر چاونیە، وەخراپترینی هاوڕێ ئەوەیە کەلەکاتی تەنگانەدا سەری هاوڕێی شۆڕئەکا، وە خراپترینی پادشا ئەوەیە کەپارێزگاری وولاتی ناکاو بێ تاوان لەزۆرو جەوری ئەترسێ، وەخراپترینی وولات ئەو وولاتەیە کەپڕە لە ترس وسەختی وەخۆشی و کامەرانی و دلنیایی تێدانییە. منیش لێرەدا لای تۆ هیچ خۆشی و حەسانەوەیەکم دەست ناکەوێ ئەی پادشا.

لەپاشان مالْ ئاوایی لێ کردوو فڕی و بەجێی هێشت.

ئەمە سەر گوزشتەی پەندی (تۆلەسێنان) بوو، کە هەرگیز نابێ باوەڕ بەیەکتر بکەن.

******

**دەرگای (کوڕە پادشاو باڵندە)**

**تەواوبوو**

# دەرگـــــــای

# (شێرو چەقەڵی خوا پەرســـــــت)



(دەبشەلیم) پادشای هیند ووتی بە (بەبەیدەبای فەیلەسووف): ئەو پەندەم بیست، ئێستا پەندی ئەو پادشایەم بۆبڵێ کەئەو کەسە ئەگێڕێتەوە بۆسەر پایەو کاری خۆی کەبەبێ گوناه سزای دابوو وەبەبێ تاوان ئازاری پێ گەیاندبوو.

فەیلەسووفەکە ووتی: ئەگەر پادشا کەسانی بێتاوان لەپاش سزا نەگێڕێتەوە بۆسەر کارو پیشەیان هەروەها کەسانی گوناهبار لەپاش سزای قورس نەگێڕێتەوە زیان بەکارو باری وولات ئەگات لەبەر ئەوە لەسەر پادشا پێویستە کەسەیری کاری ئەوانە بکات کەتوشی ئەوە ئەبن وەبزانێ ڕادەی سوودیان چەندە. ئەگەر جێگای باوەڕی پادشا و بەخاوەن بیرو هونەر ناسرابن، پێویستە کەپادشا سووربێ لەسەر گێڕانەوەیان. چونکە وولات لەگەڵ(ڕۆشنبیران)دا نەبێ ناوەستێ ئەوانیش(وەزیر)و کاربەدەستانن. ئەوانیش بەکارنایەن لەگەڵ خۆشەویستیوئاوژگاریدا نەبێ. وەئەمەش لای (ڕۆشنبیر)و پیاوچاك نەبێ دەست ناکەوێ. کارو باری پادشا یەکجار زۆرە وەکاربەدەستانی یەکجار زۆرن، بەڵام لەواندا مرۆڤی چاکو هەڵکەوتو کەمە. ئەمەش وەك سەرگوزشتەی پەندی (شێرو چەقەڵ) وایە. پادشا ووتی: ئەوەچۆن بووە؟ فەیلەسوفەکەووتی:

ئەگێڕنەوە لە(شیوێك)دا چەقەڵێك ئەژیا وەکاری هەمیشە خواپەرستی بوو، کۆمەڵێك لەگورگ و چەقەڵ و ڕێوی لەدەوری بوون، بەڵام ئەوەی ئەوان ئەیانکرد ئەم لەوە دوور بوو. لەبەر ئەوە هەموو دڕندەکان ڕقیان لێی بوو. پێیان ووت: ئێمە ڕێگا نادەین کەتۆ بەم جۆرە بژیت. تۆش ئەبێ یەکێك بیت وەك ئێمە. نازانین بۆچی وازت لەخوێن

ڕشتن و گۆشت خۆری هێناوە؟ چەقەڵ ووتی: هاوڕێیەتی ئێوە گوناهم پێ ناگەیەنێ، ئەگەر خۆم گوناه بەخۆم نەگەیەنم. چونکە گوناه لەلایەن شوێن و هاوڕێوە نییە، بەڵکو لەلایەنی دڵ و کردەوەوەیە. ئەگەر مرۆڤ لەشوێنی چاکدا کردەوەی چاك و لەشوێنی خراپدا کردەوەی خراپ بوایە، ئەوکاتە ئەگەر(خواپەرستی) لەناو مزگەوتدا بکوشتایە گوناهی نەبوو وەئەگەر لەشوێنی شەڕو کوشتاردا ڕێزی بگرتایە گوناهی ئەگەیشت. من هەربەلەش هاوڕێی ئێوەم نەك بەدڵ و کردەوە، چونکە من ئەنجامی کار ئەزانم لەبەر ئەوە دانم بەخۆمدا گرتووە و لەسەرکاری خۆم ئەڕۆم.

بەم جۆرە دەنگ و باسی ئەو چەقەڵە گەیشتە پادشای ئەو ناوچەیە کەشێرێك بوو، شێرەکە ناردی بەشوێنیا، وەسەیری کرد لەهەموو کاروو بارێکدا بەئارەزووی ئەوە. لەپاشان پێی ووت: کاربەدەستانم زۆرە. وەگەلێ یارمەتی دەرم هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستیم بەیارمەتیدەر هەیە. من بیستومە کەتۆ مرۆڤێکی ڕاستی، وەدەست پاك‌و ژیرو خاوەن ئاینی، لەبەر ئەوە حەز ئەکەم کە بتکەم بەدۆستم و کارێکی گەورەت پێ بسپێرم. (چەقەڵ ) ووتی: ڕاست ئەکەی، پادشایان ئەبێ کاربەدەستانی باش هەڵبژێرن و کارو باری وولاتیان پێبەڕێوە بەرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێ کەزۆر لەکەس بکەن بۆ ئەو کارە، چونکە زۆر لێکراو بەتەواوی کاروبار بەڕێوە نابا. وەمن حەز لەکاروبای پادشا ناکەم، چونکە هەرگیز نەم کردوە.

تۆپادشای لەجۆری دڕندە گەلێکت لایە کەهەندێکیان خاوەن دەستەڵات و هەڵمەتن وەئیشکەر و چالاکن وەلەکاروباری پادشادا

شارەزان. ئەگەر بیانکەیت بەکاربەدەست تۆیان پێویست نابێ و هەموو لایەك ئەحەسێتەوە.

شێرەکە ووتی: واز لەم قسانە بێنە من لەم کارەدا دەست لەتۆ بەر نادەم. (چەقەڵ) ووتی: دوو کەس ئەتوانن کەیارمەتی پادشا بدەن کەمن هیچیان نیم:

یەکەم: زۆردارێکی زمان لووس کەبەتاوان کاروباری خۆی بەڕێوە ئەبات وەبەپاکانەو درۆ خۆی ڕزگار ئەکات.

دووەم: گەوجێکی هەژار کەکەس ڕقەبەری لەگەڵ ناکات، مرۆڤی ڕاست لای پادشا کەم ڕزگاری ئەبێ، چونکە هاوڕێیانی لای پادشا ڕقیان لێی ئەبێ لەبەر پایەو نرخی لای پادشا، وەدوژمنانی پادشاش هەر ڕقەبەری لەگەڵدا ئەکەن، لەبەر ئەوەی کەئامۆژگاری و سود بەپادشا ئەگەیەنێ. کەئەم دووکۆمەڵەی لێ کۆبووە تووشی لەناوچوون ئەبێ. شێر ووتی: تۆ لەگەڵ مندای هیچ مەترسە بەئەندازەی کارت چاکەت لەگەڵدا ئەکەم، پایەت لای من بەرز ئەبێتەوە (چەقەڵ) ووتی: ئەی پادشا وازم لێ بهێنە بابۆخۆم بەخۆشی لەم دەشتەدا بژیم، چونکە هەروەکو ئەزانم هاوڕێیەتی پادشا ترسناکە، ئەوەی لەساتێکی لای ئەودا توشی سزاو دەردەسەری ئەبێ کەسی تر بەدرێژی تەمەنی توشی نابێ، کەوابوو ژیانێکی کەمی پڕ ئاسوودەیی چاکترە لەژیانێکی درێژی پڕمەترسی. شێرەکەووتی:

هیچ چارەم نییە وەباوەڕم بەکەس نییە لەتۆ زیاتر ئەبێ ئەم کارە هەر وەر بگریت.

(چەقەڵ) ووتی: ئەی پادشا کەوابوو دەبێ پەیمانم بدەیتێ کەئەگەر یەکێك لەدوژمنانی من لەبەر پایەم یان لەترسی پایەومانەوەی خۆی لای تۆ دەستیکرد بەدوژمنایەتی بۆئەوەی کەتۆ هانبدات بۆلەناو بردنم، ئەبێ لەکاری مندا پەلەنەکەی، وەبەووردی تەماشای بکەی، ئەوکاتە چی ئەکەی بیکە. ئەوکاتە منیش بەهەموو تواناموە کار ئەکەم.

وەماڨ تۆ بەسەر خۆمەوە ناهێڵم. شێرەکە ئەو پەیمانەی دایەو سوێندی بۆخوارد.لەپاشانداکردی بەکاربەدەستی تایبەتی گەنجینە کانی وولات، وەپایەی بەسەر هاورێکانیدا بەرز کردەوە. هاورێیانی پادشا زۆریان پێناخۆشبوو بڕیاریاندا کە شێرەکەی لێ هانبدەن. شێرەکە ئارەزووی جۆرە گۆشتێکی کەلەوەو پێش لێی خواردبوو پارچەیەك لەوگۆشتەی بەجیا دانابوو وەفرمانیدا بوو کەلەچێشتخانەدا پارێزگاری بکرێ و کەداوایکرد بۆی ببرێ، گۆشتەکەیان لەو شوێنەدا لابرد و بردیان لەماڵی چەقەڵەکەدا شاردیانەوە. چەقەڵیش ئاگاداری ئەو پیلانە نەبوو.کاتی نیوەڕۆ شێرەکە داوای گۆشتەکەی کرد، بەڵام نەبوو. لەپاشا ئەوانەی کەفێڵەکەیان نایەوە هەموو لای پادشا دانیشتن.

پادشا پرسیاری دووبارەکردەوە، وەزۆر بەوردی و گرنگی لێی کۆڵیەوە، ئەوانیش سەیری یەکتریان کرد. لەپاشان یەکێکیان وەك پیاوچاك وتی: پێویسە کەپادشا لەسودو زانینی ئاگاداربکەین هەر چەندە بەلای ئەوانەوە گرانە وەپێیان ناخۆشە. بیستومەکە (چەقەڵ) گۆشتەکەی پادشای بردوە بۆماڵەوە یەکێکی تریان وتی:

باوەڕناکەم چەقەڵی خواپەرست کاری وابکات،بەڵام بگەڕێن و بزانن و تاقیبکەنەوە بەڕاستی مرۆڤ ناسین ئاسان نییە. یەکێکی تر ووتی:بەخوا ئەم نهێنییە بەم زووانە دەرناکەوێ بەڵام ئەگەرزۆر دورنەڕۆین گۆشتەکە

لەماڵی چەقەڵدایە. یەکێکی تر ووتی: ئەگەر ئەوە ڕاست بێ چەقەڵ هەر ناپاك نییە بەڵکو سپڵەیەو بەدکاری ئەو بەرامبەر پادشا دەر ئەکەوێ. یەکێکی تریش ووتی: ئێوە هەمووتان دادپەرست و پیاوچاکن من ناتوانم کاری درۆ و ناپاکی لەئێوە بشارمەوە، چاکتروایە کە پادشا ماڵی چەقەڵ بپشکێنێ ئەوکاتە هەووشت ڕون ئەبێتەوە. لەپاشان یەکێکی تریان ووتی: ئەگەر پادشا نیازی ئەوەی هەبێ بادەست و برد بکا، چونکە دەستو پێوەندی چەقەڵ زۆرن کەئاگەداری بکەن و خۆی ڕزگار بکات .

بەم جۆرە پادشایان والێکر کە باوەڕ بکات. ناردی بەشوێن چەقەڵداو پێی ووت: کوانێ ئەو گۆشتەی کەوتم بۆمی بپارێزە. ووتی: ناردم بۆ(چێشتکەر) کەبۆ پادشای بکا بەخۆراك. پادشا لەچێشتکەری پرسی کەئەویش یەکێکبوو لەوان ووتی: درۆئەکا هیچی بۆ نەناردوم.

شێرەکەباوەڕپێکراوی خۆی نارد بۆماڵی چەقەڵولەوێ گۆشتەکەی دۆزیەوە هینای بۆبەردەمی شێرەکە.

گورگێك کەهێشتا لەو بابەتەوە هیچ قسەی نەکردبوو لەو پیاوە چاکانە ئەچوو کەلەخۆیانەوە قسە لەشتێك ناکەن هەتا بە تەواوی بۆیان ڕون ئەبێتەوە هاتا بەردەمی شێرەکە ووتی: لەدوای ئەوەی کە پادشا ناپاکی چەقەڵی بۆدەرکەوت نابێ لێی خۆش ببێ ئەگینا پادشا کردەوەی ناپاكوگوناهی تاوانباری بۆدەرناکەوێ شێرەکە فەرمانیدا کە (چەقەڵ) ببەنە دەرەوەو پارێزگاری بکەن، یەکێك لەدانیشتوانی لای پادشا ووتی: من سەرم لەوە سوڕماوە کەپادشا بەو هەموو زانین و شارەزاییەوە چۆن کاری ئەم فێڵبازەی لێ ونبوو؟ بەڵام لەوەش

سەیرتر ئەوەیە لێی خۆش ئەبێ لەپاش ئەوەی کەلێی دەرکەوت، شێرەکە یەکێکی لەوانە کەلەو پیلانەدا هاوبەش بوون نارد بۆلای چەقەڵ و داوای لێبوردنی لێکرد. ئەویش نامەیەکی خراپی بەزمانی چەقەڵەوە نوسی و هێنای بۆلای (شێر) ئەویش لەونامەیە ڕقی هەستاو فەرمانی کوشتنی چەقەڵی دا.

دایکی شێرەکە کەبەوەی زانی تێگەیشت کەکوڕەکەی پەلەی کردووە. لەبەر ئەوە ناردی بەدوای ئەوانەدا کەفەرمانی کوشتنی ئەویان پێ درابوو کەکوشتنەکەی دووابخەن، خۆشی چوو بۆلای شێرەکەو پێی ووت: کوڕم لەبەرچی فەرمانتداوە بەکوشتنی چەقەڵ؟ ئەویش کارەساتی بۆگێڕایەوە. دایکی ووتی: پەلەت کرد کوڕم پیاوی ژیر لەجیهاندا ئەوەندە سەرئەکەوێ کەوازلەکاری پەلەبهێنێ وخۆی ڕابگرێ، مرۆڤی هەڵەشە هەمیشە بەری پەشیمانی ئەخوا بەهۆی کەم تێبینیەوە. وەکەسیش وەك پادشا کاری بەلەسەر خۆیی و لێکدانەوە نییە. زاناکان ووتوویانە: ژن بەهۆی مێردیەوە ژنە، وەمناڵ بەباوك و دایك، قوتابی بەمامۆستا، سەرباز بەفەرماندەر، خواپەرست بەئاین، خۆپاراستن بەژیری وەژیری بەنەرمی، وەسەری هەمووان خۆڕاگرتن و نەبەزیە. وەسەری هەموو خۆڕاگرتن ونەبەزییەك بۆپادشائەوەیەکەهاوڕێ بناسێ، وەهەر یەکەیان لە شوێن و پایەی خۆیدا دابنێ، وەلەدوزمانی و درۆی هەندێکیان بۆئەوانی تر ئاگادار بێ. ئەگەر هەندێکیان ڕێگایان هەبێ، هەندێکیان بەئاسانی لەناو ئەبەن.

تۆ چەقەڵت تاقیکردوەتەوە، کەپاك و ڕاستە، وەژیرو زانایە، وەهەتا ئێستە هەر ستایشت کردووە. ئەمە بۆتۆ جواننیە کەخراپەی دەربارە

بکەی لەدوای ئەوەی کەدڵنیات کردووە و پەیمانی ڕزگاریت داوەتێ.
چەقەڵ دوژمنی زۆرە هەرئەوانن کەئەو پیلانەیان لێکرد، وەگۆشتەکەیان برد بۆماڵی ئەوان و لەوێدا شاردیانەوە (کۆلارە) ئەگەر پارچە گۆشتێك بەقاچیەوەبێ هەموو باڵندەیەك سەری تێ ئەکا، وە (سەگ) ئەگەر ئیسقانێکی بەدەمەوە بوو (سەگەل) لێی کۆ ئەبێتەوە. ئەمەش ڕاست نیە کەپادشا پەلە بکات بەکوشتن لەبەر پارچەیەك گۆشت. چەقەڵ هەتا ئێستا هەرسودبەخش بووە، وەلەبەر حەسانەوەی تۆ هەموو ئازارێکی هەڵگرتووە،وەهەرگیز نهێنیەکی لەتۆ نەشاردۆتەوە ئێستا کاری واچۆن ئەکا؟

لەم قسانەدابوون یەکێك لەباوەڕپێکراوەکانی شێر لەدەرگای داو هاتە ژوورەوە و ئاگاداری کردن کەچەقەڵ بێتاوانەو ئاگای لەوکارە نییە. دایکی شێرەکە ئینجا وتی: پێویستە کەپادشا نەیەڵێ ئەوانەی کەئەو پیلانەیان گێڕا، بەخێرایی دەرچن بۆئەوەی کە لەپاشەڕۆژدا تاوانی گەورەتر نەکەن، وە ئەبێ سزایان بدات، چونکە پیاوی ژیر نابێ لەو کەسانە خۆشبێ کە ناپاك و زۆردارن وەباوەڕیان بەسزاو لێپرسینەوە نیە، ئێستە ئەنجامی تورەبوونی کتوپڕت بۆدەرکەوت کەچەند مرۆڤ بەهەڵەدا ئەبا. ئەوەی بەکەم تورە ببێ بەزۆر قایل نابێ.

چاکتر وایە لەپێش هەموو شتێکدا چەقەڵ بانگ بکەی، وەداوای لێبوردنی لێبکەی.چونکە گەلێ کەس هەیە کەنابێ وازیان لێبهێنرێ

ئەوانیش ئەوکەسانەن کەبەپیاوەتی و ڕاستی و بەخشندەیی خۆشەویستی ناسراون، وەدورن لەوەی کەبەچاوی بەد تەماشای ماڵ و سامان و پایەی هیچ کەس بکەن، وەیارمەتی هاوڕێ ئەدەن هەرچەندە کەزۆری تێ بچێ. بەڵام ئەوانەی کەپێویستە وازیان لێبهێنرێ ئەوانەن کەبەناپاکی و دڕندەیی و دووری لەهەموو بەزەیی و دڵسوزیەکەوە ناسراون. وەباوەڕیان بەسزاو لێپرسینەوەی دواڕۆژ نیە .

شێرە کە ناردی بەدوای چەقەڵدا، وەداوای لێبوردنی لێکرد. چەقەڵ ووتی: خراپترینی هاوڕێ ئەوەیە کەنەیەڵێ توشی قازانج ببێ بەهۆی زیانی هاوڕێیەوە وەئەوکەسەش کەهاوڕێی وەك خۆی سەیرناکا یائەیخاتە سەر ڕێگەیەکی خراپ لەبەر ئارەزووی خۆی، زۆر جار ئەمە لەناو برادەراندا ڕوو دەدات.

باپادشا بەلایەوە گران نەبێ من جارێکی تر باوەڕم پێی نەماوە، وەپادشا نابێ هاوڕێی کەسێك بێ کەبەهێزترینی سزای داوە، وەنابێ یەکجار وازی لێبهێنن و لەناوی ببەن نەء پیاوی بەرز کەدەرکرا وەلەکاتی دورخستنەوەشیدا ئەبێ هەر ڕێزی ببێ.

شێرەکە گوێی نەدایەو پێی ووت: من تۆم تاقیکردوەتەوە و زانیومە کەئەوانە کێن کە بەدرۆو فێڵ منیان لە تۆ هاندا، ئێستە تۆڵای من نرخت هەیەو پایەت بەرزتر ئەبێتەوە، پیاوی باش تۆزێك لەچاکە گەلێك خراپەی لە دڵدا لائەبا. ئێمە گەڕاینەوەو باوەڕمان بەتۆکردووە تۆش

بگەڕێوەو باوەڕمان پێ بکەرەوە، بەوە هەردوولامان شاد ئەبین چەقەڵەکە بەقسەی پادشای کردو گەڕایەوە بۆسەر پایەیەکی بەرزتر لەجاران لەسەر فەرمانی پادشا، وەپادشا ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر ڕێزی ئەگرت و زیاتر لەخۆی نزیك ئەکردەوە.

* * *

دەرگای (شێرو چەقەڵی خواپەرست)

تەواو بوو...

# دەرگـــای
# (ئیـــلازو بـــلازو ئیـــراخت)



(دەبشەلیم) پادشای هیند ووتی بە(بەیدەبای فەیلەسوف)ئەو پەندەم بیست، ئێستا باسی ئەو شتانەم بۆبکە کەپادشا دەسەڵات و وولاتی پێ بپارێزێ وەسەری هەموو کارو کردەوەیەکی بێ، ئایا بەنەرمی یان بەپیاوەتی یان بەئازایەتی یان بەبەخشندەیی ئەوە ئەکا؟ بەکامیانە؟

(بەیدەبا) ووتی: چاکترینی ئەوشتانە بۆ پادشا نەرمی ولەسەر خۆییە، وەبەوە وولاّت ئەچێ بەڕێوە. وەسەری هەموو کارو کردەوەیەکە وەبەنرخترى هەمووشتێکە بۆپادشا، وەك ئەوەی کەئەگێڕنەوە پادشایەك هەبوو ناوی (ئیلاز) بوو، وە وەزیرێکی هەبوو بەناوی (بلاز) وەژنەکەی ناوی (ئیراخت) بوو ئەم پادشایە شەوێك هەشت خەوی دی وەبەترسەوە بەئاگای هاتەوە، ناردی بەشوێن کۆمەڵێك لە(بەراهیمە)کاندا کەخواپەرست بوون پادشا خەوەکانی بۆگێڕانەوە. ئەوانیش ووتیان: بەڕاستی پادشا شتی سەیری دیوە. ئەگەر حەوت ڕۆژ ماوەمان بدات مانای خەوەکانی پێ ئەڵێین. لەپاشان هاتنە دەرەوە، وەلەماڵی یەکێکیاندا کۆبونەوەو ووتیان: دوێنێ دوانزە هەزار کەسی لێ کوشتوین، ئێستا نهێنی خۆی پێ ووتووین، ئادەی بابیترسێنین هەتا لەترسی گیانی خۆی ئەوەی ئێمە ئەمانەوێ بیکا. پێی ئەڵێین خۆشەویستەکانت بدە بەئێمە بابیان کوژین،چونکە لەکتێبەکانماندا دیومانە کە ئەو بەڵاگەورەیەت لەسەر لاناچێ کەتوشی ئەبی هەتا ئەوانە نەکوژی کەئێمە پێت ئەڵێین. کەووتی: کێتان ئەوێ کەبیکوژن؟ ئە ڵێین:

شاژن ئیراختمان ئەوێ کەدایکی(هاوڕێ)ی خۆشەویستتە،وە (هاوڕێ)ی کوڕتمان ئەوێ، وەبرازاکەت، وەخاوەن شکۆ سەرەك وەزیر (ئیلاز) وە(کالا) نوسەری گەورە و خاوەنی شمشێرو نهێنی کەوێنەی نییە، وەفیلی سپی کەئەسپ نایگرێ، وەئەسپی کوشتارت وەدووفیلە گەورەکەی تر لەگەڵ فیلە نێرەکەو ووشترە بەهێزوتیژڕەوەکەدا. وەئەڵێین: (گەورە زانامان)ئەوێ کەشارەزای هەمووکارو بارێکە بۆئەوەی

کە تۆڵەی خۆمانی لێ بسێنین لەوەی کەلەگەڵ پادشادا پێی کردین، لەپاشا ئەڵێین دەی پادشا ئەوانەی کەپێمان ووتی ئەبێ سەریان ببڕی و خوێنەکەیان بکەیتە ناوچاڵێك هەتا پڕئەبێ، لەپاشا خۆت ڕووت بکەیتەوەو لەناویا دابنیشی. کەهاتیتە دەرەوە ئێمە کە(نەتەوەی بەراهیمەین) لەهەرچوارلای ووڵاتەوە کۆئەبینەوە بەدەورتا ئەسوڕێینەوە و پاڕانەوەت بۆئەکەین و تفت لێ ئەکەین و خوێنت ئەسڕین وەبەئاوی پاكو گوڵاو ئەتشۆین، لەپاشا ئەچیتەوە بۆئەوکۆشکەی کە بۆت ڕازاوەتەوە. بەم جۆرە خوای گەوەرە ئەوبەڵا گەورەیەت لەسەر لائەبا کەئێمە زۆر لەتۆ لێی ئەترسین. ئەگەر ئەم کارەت پێ گران نەبوو وە ئارامت گرت ئەوابەپادشایی وگرانبەهایی ئەمێنیتەوە،وە خۆشەویستت لەپاش ئەوان بۆپەیدا ئەبێتەوە.

بەڵام ئەگەر وانەکەیت ئێمی ئەترسین کەپادشاییت لێ زەوت بکرێ یان خۆت لەناو بچی.

ئەگەر بەقسەی کردین و ئەوشتانەی کرد بەئارەزووی خۆمان ئەی کوژین. کاتێك کەپیلانەکەیان ڕێکخست ڕۆژی حەوتەم چوونەوە بۆلای پادشا، وەلەکاتێکدا کەتەنیابوو پێیان ووت: ئەی پادشای بەڕێز مانای خەوەکانتمان بەتەواوی زانیوە،وەچارەو ڕێگامان بۆداناوی کەکامەرانی و خۆشی بۆئێوە تیادایە. لەپاشا قسەکانیان بۆکرد.

پادشا ووتی: مردنم بەلاوە ئاسانترە لەژیانم لەدوای کوشتنی ئەوانەی کەهۆی مانەوەی من و ڕاگری ژیانی منن. هیچ چارە نییە من هەر ئەمرم وەهەتا کۆتایی جیهان هەر پادشا نابم مردن و جیابوونەوەی خۆشەویستانم بەلاوە وەك یەکە.

(بەراهیمەکان) ووتیان: ئەگەر لێمان زویر نابی پێت ئەڵێین ووتی: فەرموو قسەبکەن.

ووتیان: ئەی پادشا ڕاست ناکەی کەئەڵێی گیانی کەسانی ترم بەلاوە خۆشەویستترە لەخۆم.

خۆت و تەختت بهێڵەوەو ئەمکارە بکە کەچاکەی تۆی تیادایە وەبەڕاستی ڕزگارت ئەکا. وە لەبەرچاوی دانیشتوانی وولاتەکەت شاد ببەو لەکاری گرنگدا مەوەستە و ئیشی سوك و بێ فەڕ مەکە، بزانە ئەی پادشا مرۆڤ کەلەجیهاندا ژیانی خۆش ئەوێ تەنها لەبەر مانەوەی خۆیەتی، وەخۆشەویستانی لەبەر خۆش گوزەرانی و ڕابواردنی خۆی خۆش ئەوێ.

تۆ ئەم تەختەت بەخۆڕایی دەست نەکەوتووە، بەڵکو بەسزاو ناخۆشییەکی بێئەندازە لەپاش ساڵەهای ساڵ کەوتووەتە ژێر دەستت، ئێستاش نابێ هەروا بەسووکی لەدەستی بدەی. گوێ لەئامۆژگاری ئێمە بگرەو قازانجی خۆت لەدەست مەدە. ئەی پادشا هیچ مەترسە ئەم کارە هیچ زیانی تۆی تیا نییە.

کەپادشا ئەم قسانەی لێ بیستن زۆر زویر بوو، خۆی پێ ڕانەگیرا، هەستاو بەجێی هێشتن و وەچووە ژوورەکەی خۆی و بەسەر دەمدا کەوت و دەستی کرد بەگریان و پێچی خواردوو وەك ماسییەك کەلەئاو دەری دێنن، وەلەدڵی خۆیدا ووتی:

نازانم لەم دووکارە کامیانم بەلاوە گرنگ بێت: پادشایەتی، یان کوشتنی خۆشەویستانم؟ من ژیانم بۆچییە کە(ئیراخت) هەرگیز نەبینم؟ وە پادشایەتیم چۆن بۆ ئەکرێ کە(ئیلان)ی سەرەك وەزیرم لەناو برد؟

وەکەئەوانەم هەموو کوشت ئیتر چۆن پێم ئەوترێ پادشا؟ لەپاشا دەنگوباسی پەژارەیی و خەفەتی پادشا بڵاو بۆوە. (ئیلاز)ی وەزیر کەبەو جۆرە ئەوەی دی هەستا چوو بۆلای (شاژن ئیراخت) و ووتی: من لەو کاتەوە کەیارمەتیدەری پادشابووم هیچ نهێنیەکی لەمن نەشاردۆتەوە، ئێستا چەند شەوێکە لەگەڵ کۆمەڵێ لە(بەراهیمە)کاندا کۆبوونەوەئەکات، ئەترسم کەنهێنی خۆی دابنە دەست وەلەئەنجامدا توشی کارەساتێکی سەختی بکەن. من ئەزانم کەپادشا کارێکی گرنگی هەیەو کەس ئاگادار ناکا. وەرەوشتی وایە لەکاتی زویربووندا پرسیار لە کەس ناکات. وەکاری گەورەو بچووکی بەلاوە وەك یەکە. هەستە تۆ برۆ بۆ لای وە لە پاشا من ئاگادار بکە.

(ئیراخت) ووتی: بەخوا لە گەڵ پادشادا هەندێك ناکوکیمان بووە ئێستا لەم کاتەدا ناچم بۆلای.

(ئیلاز) ووتی: لەم کارە گرنگەدا ناکۆکی بەکاری ئێمە نایەت هەستە برۆ بۆلای بەقسەی من بکە ئەمە حەسانەوەی گەل و وولاتی تیادایە.

(ئیراخت) چوو بۆلای پادشا لەپاش هەواڵ پرسینی ووتی: ئەی پادشای بەرێز لەبەر چی خەفەت ئەخۆی، وەچیت لە(بەراهیمەکان) بیستووە هەتا ئێمەش هاوبەشی خەفەتت بکەین؟. پادشا ووتی: ئەی (ئیراخت) پرسیاری کاری من مەکە، چونکە لەناوچونی من و تۆو گەلێك لەخۆشەویستانی گەلەکەمی تیادایە.

(ئیراخت) ووتی: ئەی پادشا لەهەموو کەس ژیرتر ئەو کەسەیە کەکارەساتی بەسەرداهات لە هەموو کەس زیاتر دان بەخۆیدا ئەگرێ، وەزیاتر گوێ لەقسەی کەسانی ژیرو ئامۆژگاریکەر ئەگرێ هەتا

بەهەوڵ و تەقەلاو پرس کردن و ژیری چارە ئەدۆزێتە وە و خۆی ڕزگار ئەکا. گەورەترینی پیاوخراپ کە گەورەترینی تاوانی کردووە هەر هیوای لێبوردن و ڕزگاربوونی هەیە. خەفەت مەخۆ ئەی پادشا چونکە کەڵکی نییە وەکاری ڕابردووی ڕۆژگار ناگێڕێتەوە. خەفەت هەر لەش لاواز و دوژمن خۆش ئەکات. پادشا ووتی: خەونم دیوە بەراهیمەکان ووتوویانە: هیچ چارەت نییە کوشتنی ژنەکەت و خۆشەویستانت نەبێ، منیش لەدوای ئێوە ژیانم بۆچییە؟ (ئیراخت) ووتی: ئەی پادشا من لەبەر خۆشەویستی تۆ یەك ئامۆژگاریت ئەکەم ئەویش لەبەر مانەوەی خۆم نییە کەپێت ئەڵێم کوشتن کارێکی گەورەیە، تۆ ناتوانی کوژراو زیندو بکەیتەوە. ئەی پادشا باوەڕ بەقسەی (بەراهیمەکان)مەکە هەتا پرس بەوەزیران و باوەڕپێکراوانی دڵسۆزت نەکەی. زاناکان ووتوویانە: ئەگەر گەوهەرێکی بێ نرخت دەست کەوت لەکیسی خۆتی مەدە هەتا نیشانی ئەو کەسەی ئەدەی کەباشی ئەناسێ. تۆ دوژمنی خۆت ناناسیت.

دوێنێ دوانزە هەزارت لێ کوشتن ئێستا باوەڕمەکە ئەمانیش لەوان نەبن.

بەگیانی تۆ سوێند ئەخۆم، ئەبوایە خەوەکەت لای ئەوان هیچ باس نەکردایە. ئەگەر بەقسەت بکردنایە، وەهەموو کاربەدەستە گەورەکانی خۆتت بکوشتایە ئەوکاتە بەئاسانی لەناویان ئەبردی و پادشایی ئەکەوتەوە دەست خۆیان وەك جاری جاران.

هەستە بڕۆ بۆلای(زانای گەورە) وە خەوەکەتی بۆبگێڕەوە ئەو بەڕاستی مانایت پێ ئەڵێ. کاتێك پادشا ئەوەی بیست خەفەتی نەماو سواری ئەسپەکەی بوو چوو بۆلای(زانای گەورە) لەپاش ڕێزگرتن و حەسانەوە، خەوەکانی بۆگێڕایەوە. (زانای گەورە) ووتی: ئەی پادشا لەم خەوانەت هیچ مەترسە. ئەو دوو(ماسیە سوورە)ی کەلە خەوتا لەسەر کلك وەستابوون، مانای ئەوەیە کەپادشای (نەهاوەند) دووملوانکەی یاقووت و زمڕووتی سورت بەدیاری بۆ ئەنێرێ کەنرخیان چوار هەزار کیلۆ ئاڵتوونە. وەئەو(دووقازە)ی کەلەدواتەوە فڕین و لەبەر دەمتدا نیشتەوە ئەوەیە کەلە (پادشای بەڵخەوە) دوو ئەسپت بۆ دێ کەوێنەیان نیە. وەئەو مارەی کەبەسەر قاچی چەپتدا ڕۆیشت ئەوەلە پادشای (سینجینەوە) شمشێرێکی ئاسنی زۆر نایابت بۆ دێ. وەئەو خوێنەی کەلەشت پێ سوور کردبوو ئەوەیە کەلە پادشای (کازەرونەوە) دەستێ جلی سەیرت بۆدێ کەپێی ئەوترێ (خشلی ئەرخەوان) وەلەتاریکیدا شەوق ئەداتەوە وەئەوەی کەلەخەوتا بەئاو خۆتت ئەشت ئەوەیە کەلە پادشای(ڕیهزینەوە) دەستێك جلی کەتانی سپیت بۆ دێ. وەئەوەی کەچاوت پێ کەوت لەسەر کێوێکی سپی دانیشتبووی ئەوە لەپادشای (فیلێك)ی سپیت بۆدێ کەئەسپ بۆی ناگیرێ لەغاردا. وەئەوەی وەك ئاگروابوو بەسەرسەرتەوە ئەوەیەکەلە پادشای(ئەرزنەوە) تاجێکت بۆدێ کەبەیاقومتو زمڕووت دەور دراوە وەئەوباڵندەیەی کەدەنوکیدا بەسەرتا ئەوەت ئەمڕۆ پێ ناڵێم، بەڵام هیچ مەترسە زیانی

تیا نیە، تەنهاکەمێك ناکۆکی ئەبینی لەگەڵ یەکێك لەخۆشە ویستانتدا.
ئەمە مانای خەوەکانتە ئەی پادشا.

لەپاش حەوت ڕۆژ وەك (زانای گەورە) ووتی: مژدەیاندا بە پادشا وەئەو شتانەیان گشت بۆ هێنا، پادشا زۆر سەیری لەزانینی (گەورەی زانا) سوڕما، وەلەدڵی خۆیدا ووتی: ئەگەر خوای گەورە بەزەیی پیاما نەهاتایەتەوە لەناو ئەچوم، ئیتر پێویستە کەپیاو گوێ لەبرا دەری ژیرو دڵسۆز بگرێ.

(ئیراخت ڕێگای) باشی بۆدانام کەپێی سەرکەوتم.لەپاشا بە(ئیلان)ی ووت کە جلەکان هەڵبگرێ بۆ ژوری دانیشتنی ژنان. پادشا بانگی (ئیراخت) وە(حۆری) کرد کەهەردووکیان بەرزترین ژنانی پادشا بوون. (ئیلان) جلەکان و تاجەکەی لەبەر دەستیاندا دانا (ئیراخت) تاجەکەی پەسەند کردو (حۆریش) دەستە جلێکی هەڵگرت کەلەهەموو جلە دیاریەکان جوانتر بوو.

ئەو ئێوارەیە ئیراخت تاجەکەی لەسەر نابوو، سینییەك برنج و حەڵوای بەسەر دەستەوە بوو بۆ پادشای ئەبرد، (حۆری) کەئەوەی دی پێی گران بوو، خێرا جلە نایابەکەی لەبەرکردوو هاتە بەردەمی پادشا، پادشا لەجوانی جلەکان سەری سوڕما.

بەئیراختی ووت: تۆ زۆر گەوج بوویت کەتاجەکەت هەڵگرت جلەکان چاکترە،چونکە لەگەنجینەکانی ئێمەدا شتی وانایاب نییە. کەپادشا ئەو قسەیەی لەبەرچاوی(حۆری) بە (ئیراخت) ووت، (ئیراخت) ڕقی هەستاو

دڵی گەرم بوو سینییە حەڵواکەی ماڵی بەسەری پادشاداو هەمووی بەسەرو چاویدا هاتە خوارێ.

پادشا لەجێگای خۆی هەستاو بانگی (ئیلاز)ی کردوو ووتی: من پادشای جیهانم بڕوانە ئەم نەزانە چۆن ئابڕووی بردم. هەر ئێستا بیبەرە دەرێ و بیکوژە. (ئیلاز) لەوێ دا هێنایە دەرێ و لەدڵی خۆیدا ووتی: ئەمە ژنێکی کەم نییە پادشا ئارامی لەسەر ناگرێ، چونکە لەمردن ڕزگاری کردووە. نایکوژم هەتا پادشا تاقی ئەکەمەوە، ئەگەر پەشیمان بوو لەکوشتنی و زویربوو بەساغی بۆی ئەبەمەوە، بەڵام ئەگەر هەرلەخۆشی و ڕبواردندا بوو وەفەرمانی بۆ کوشتنی ئەو هەر بەڕاست ئەزانی ئەواکوشتنی ئیراختم لەدەست ناچێ. لەپاشا بردیەوە بۆماڵی خۆیان. (ئیلاز) شمشێرەکەی خوێناوی کردوو بەزویری هاتە لای پادشاو ووتی: فەرمانەکەت گەیشت ئەی پادشا. لەپاش ماوەیەك کەپادشا ڕقی نیشتەوە، سەری سوڕمابوو نەی ئەزانی چی بڵێ، لەگەڵ ئەوەشدا ڕووی نەئەهات کەلە (ئیلاز) پرسیار بکا: ئایا بەڕاستی ئەو فەرمانەی بەجێ هێنا یان نەء. زۆر پەشیمان بۆوە وەهیوای وابوو کەئیلازی وەزیری زانا، کاری وای نەکردبێ.

(ئیلاز) ڕووی تێکردوو ووتی: خەفەت مەخۆ ئەی پادشا چونکە خەفەت سوودی نییە، تەنها مرۆڤ لەناو ئەبا.

ئارام بگرە لەسەر کاری ڕۆیشتوو کەدەسەلات بەسەریانییە ئەگەر ئارەزوو ئەفەرمووی قسەیەکی خۆشت بۆ ئەگێڕمەوە پادشا ووتی: باشە.

ئیلاز ووتی: ئەگێڕنەوە دووکۆتری نێرەومێ هێلانەکەیان پڕ ئەکەن لەگەنم و جۆ وەبڕیار ئەدەن هەتا زستان لێی نەخۆن، لە دەرەوە لە دەشت و بیاباندا بچننەوەو بیخۆن. لەپاشان نێرەکە ڕۆیشت ماوەیەکی زۆری پێ چوو نە هاتەوە، هاوین هات گەنم و جۆی ناو هێلانەکە ووشك بۆوە و هاتەوەیەك. لەپاشان نێرەکە هاتەوە سەیریکرد دانەوێڵەکەی بەکەم هاتە پێش چاو، بەمێ یەکەی ووت: ئێمە بڕیارمان وابوو کەهیچ لەدانەوێڵەی ناوهێلانەکە نەخۆین هەتا زستان؟ بۆچی لێت خوارد؟ مێ یەکە سوێندی خوارد کەهیچی لێ نەخواردووە.

زۆر هەوڵیدا بێ سوود بوو، نێرەکە باوەڕی نەکرد، وەبەدەنووك دەستی کرد بەلێدانی هەتا کووشتی. زستان هاتە پێشەوەو باران باری دانەوەڵەکە خووسایەوەو هەروەکو جاران هێلانەکەی پڕ کردەوە. کۆترەکە زۆر پەشیمان بۆوە، وەلەتەنیشت مێ یەکەوە ڕاکشاو ووتی: لەدوای تۆ ژیان و دانەوێڵە بەکاری من نایە کەبۆت بگەڕێم و نەت بینم، وەنەتوانم کەزیندووت بکەمەوە، وەکە یادت بکەمەوە کەزوڵمم لێ کردووی. لەپاشا کۆترەکە خەفەت خواردنی درێژەی کێشا، وەتامی خواردن و خواردنەوەی نەکرد هەتا لەتەنیشتی مێ یەکەوە بۆ خۆی مرد. ئەی پادشا مرۆڤی ژیر هەرگیز لە سزاداندا پەلە پەل ناکا

بەتایبەتی کە لە پەشیمانییەوە نزیکبێ وەك پەشیمان بوونەوەی کۆترە نێرەکە. هەروەها ئەگێڕنەوە کەپیاوێك کاسەیەك نیسکی بەسەر سەرەوە بوو، بەکێویێکدا هەڵئەگەڕا. کاسەکەی دانا کەبحەسێتەوە، مەیمونێك لە دارێکەوە هاتەخوارێ و مستێك لەنیسکەکەی هەڵگرت و بەدارەکەدا هەڵگەڕا. لەوێ دەنکێك لەدەستی کەوتە خوارێ و دووبارە لەدارەکەوە هاتەخوارەوە بەشوێنی ئەو تاقە دەنکەدا ئەگەڕا، بەڵام نەیدۆزییەوە، لەرقا هەموو نیسکەکەی ناودەستی فڕێدا.

تۆش ئەی پادشا شانزەهەزار ژن و کەنیزەکت لەدەور هەیە کەچی بۆ ئەو تاقە یەکە ئەگەڕێیت کەنایدۆزیتەوە.

پادشا کەئەوەی بیست ترسا کە (ئیراخت) کوژرابێ، بە (ئیلان)ی ووت: بۆچی پەلەت کرد، وەبەبیستنی تاقە یەك قسە فەرمانێکت بەجێ هێنا؟ (ئیلان) ووتی: ئەی پادشا ئەوەی کەقسەی یەکەو ناگۆڕێ هەر خوای گەورەیە. پادشا ووتی:

بەخوا ئیشت لێ تێکدام، وەبەکوشتنی (ئیراخت) توشی خەفەتت کردم. (ئیلان) ووتی:

دوو کەس ئەبێ لەجیهاندا خەفەت بخۆن: ئەوەی کەهەرگیز چاکەی نەکردووە وەئەوەی هەموو ڕۆژێك گوناه ئەکا. چونکە لەجیهاندا هەر خۆشییەکی کەم ئەبینێ، وەلەپاشەڕۆژدا سزای سەخت و گران ئەچێژێ کە لەتەواناو ووزەیدا نییەو نایەتە ژمارە.

پادشا ووتی: وادیارەمن جارێکی تر (ئیراخت) نابینم.

(ئیلاز) ووتی: دووکەس نابینن: کوێرو بێ مێشك. هەروەك کوێر ئاسمان و ئەستێرەو جوانی سرووشت و دوورو نزیك نابینێ پیاوی بێ مێشکیش چاك و خراپ و جوان و ناشرین لەیەك جوێ ناکاتەوە.

پادشا ووتی: ئەگەر ئەم جارە (ئیراخت)ببینم ئیتر خەفەتم نامێنێ و بەتەواوی شاد ئەبم. (ئیلاز) ووتی: دووکەس بەتەواوی شادن شارەزاو زانا. هەروەکوو شارەزا لە کاروباری جیهان ئەزانێ وە لە دوورو نزیکدا شارەزایی هەیە، بەو جۆرەش زانا چاکەو خراپە ئەزانێ و پەکی ناکەوێ و ئەچێتە سەر ڕێی ڕاست.

پادشا ووتی: ئەی (ئیلاز) واچاکە خۆمانت لێ دوور بخەینەوە. ئیلاز ووتی: دووکەس ئەبێ خۆیان لێ دوور بخرێتەوە، ئەوەی کەئەڵێ هیچ شتێك بۆمن نییە نەچاکە نەخراپە، نەسزا، نەپاداش لەوەی کەمن ئەیکەم.

وەئەوەی کە چاو لە هیچ شتێك ناگێرێتەوە وەگوێ بۆچاك و خراپ هەڵ ئەخا، وەهەرگیز بۆ کردنی گوناە بێ دڵی خۆی ناکا.

پادشا ووتی: تازە من دەستم لە (ئیراخت) بەتاڵ بوو.

ئیلاز ووتی: سێ شت بەتاڵن: ڕووباری بێ ئاو، خاکی بێ پادشا، ژنی بێ مێرد، پادشا ووتی: ئەی ئیلاز تۆ لەوەلأم دانەوەدا[1] پەیامت بۆدێ (ئیلاز) ووتی: سێ کەس لە وەلأم دانەوەدا پەیامیان بۆدێ:

---

[1] پەیام – فێرکردن–وەحی

پادشای بەخشندە، ژنی خانەدان، وەپیاوی زانای سەرکەوتوو لە کاروو باری چاکەدا.

لەپاشا کە (ئیلان) پادشای بەو جۆرەدی کەچەندە پەرێشان و دڵ تەنگە پێی ووت: ئەی پادشا (ئیراخت) زیندووە.

پادشا زۆر دڵی خۆش بوو، ووتی: (ئیلان) لەبەر ئەوە توورە نەبووم کە لەقسەی ڕاستو ئامۆژگاریت شارەزابووم وەهیوام بەمێشك و زانینت هەبوو کەئیراختت نەکوشتبێ، هەرچەندە کەکارێکی گەورەو قسەی ڕەقی کرد، بەڵام ئەبوایە من ئارامم بگرتایە و ئەو فەرمانەم نەکردایە. تۆش ئەی(ئیلان) تاقیتکردمەوە بەوەی کەلەو کارەدا دودڵت کردم. بەڕاستی دەستێکی باڵات پەیدا کرد، من هەمیشە سوپاست ئەکەم، بڕۆبیهێنە بۆئێرە. (ئیلان) چوو لەماڵی خۆیان (ئیراخت)ی برد بۆ لای پادشا (ئیراخت) داوای لێبووردنی کرد، پادشاش لێی خۆشبوو، وەزۆر سووپاسی ئیلازی کرد کە کوشتنەکەی دواخست.

پادشاش ووتی: ئەی (ئیلان) تۆ لەمڕۆ بەدواوە لە ووڵاتی مندا سەربەستی، وەهەر کارو بارێك خۆت بەچاکی ئەزانی ئەتوانی فەرمانی لەسەر بدەی. من پایەت بەرز ئەکەمەوە و باوەڕم پێت هەیە.

ئیلاز ووتی: خوابت هێڵێ ئەی پادشا. من مافی ئەوەم نییە، بەندەیەکی تۆم.

بەلام تکا لەپادشای بەڕێز ئەکەم کەجارێکی تر لەکاری گەورەدا پەلە نەکا کەلەپاشدا پەشیمان ببێتەو، بەتاییبەتی دەربارەی ئەم شاژنە دڵسۆزە بێ وێنەیە.

پادشا ووتی: ڕاست ئەکەی لە مەودوا هیچ شتێکی دەربارە ناکەم نەخوازە وەك ئەم کارە گەورەیەی کەبەهۆی کۆبوونەوەو بیرکردنەوەو پرس کردن بەتێگەیشتوانی دڵسۆزەوە نەبوایە لێی ڕزگار نەئەبووم.

پادشا پایەی ئیلازی بەرزکردەوەو پاداشتی چاکەی دایەوە، وە پایەوجێگای(بەراهیمەکان)کەفەرمانیان پێدا بەکوشتنی کاربەدەستان و خۆشەویستانی، هەمووی بەخشی بەو، وەشمشێری لەوان خستە کارو لەناوی بردن. بەم جۆرە پادشاو هەموو گەورەکانی وولات شاد بوون. وەسوپاسی خوایان کرد، لەپاشا سوپاسی(زانای گەورە)یانکرد کەبەهۆی زانینیەوە پادشای دادپەرست و وەزیری بەناو بانگ و شاژنی گەورەی ڕزگار کرد.

*** *** ***

**دەرگای**

**(ئیلاز، و بلاز، و ئیراخت)**

**تەواو بوو**

# دەرگـــــای
## (شێــــر و ڕاوکەر و چــەقەڵ)





(دەبشەلیم) پادشای هیند ووتی بە(بەیدەبای فەیلەسووف) ئەو پەندەم بیست، ئێستا پەندی ئەو زۆردارەم بۆباس بکە کە تووشی سزاو دەردی سەری بوو واز لەئازاردانی کەسانی تر دێنێ و ئەچێتە سەر ڕێی ڕاست.

فەیلەسووفەکە ووتی: مرۆڤی تێگەیشتوو هەرگیز زۆر لەکەس ناکا، بەڵام ئەوانەی کەدەست درێژی ئەکەن و بەبێ ماف ئازار بەئادەمیزاد ئەگەیەنن کەسانی گەوج و نەزانن کەسەیری دوارۆژ ناکەن کە لە ئەنجامدا تووشی سزاو فەلاکەت بن، وەپیاوخراپ بەمردن نەبێ لەسزای خۆی ڕزگاری نابێ، وەئەوەی لە ئەنجامی کار نەکۆڵێتەوە، بەدەم سزاوە ئەتلێتەوە. وەدوور نییەکەپیاوی بێمێشک واز لەئازاردان و خراپە بێنێ بەهۆی سزایەکەوە کەتووشی ئەبێ، ئیتر پەشیمان ئەبێتەوەو تەمێ خوار ئەبێ، وەبەهۆی ئەوەوە تووشی هەندێك قازانج ئەبێ لە پاشە ڕۆژدا. ئەمەش وەك سەر گوزشتەی (شێرو ڕاوکەرو چەقەڵ) وایە.

پادشا ووتی: ئەوە چۆن بوو؟

فەیلەسووفەکە ووتی: ئەگێڕنەوە دەڵەشێرێك لە دارستانێکدا ئەژی و دوو بەچکەی ئەبێ، ڕۆژێك کەخۆی لەڕاوبوو(ڕاوکەرێك)بەلای لانەکەیدا تێپەڕی و چاوی کەوت بەبەچکەکان. لە پاشا تیر بارانی کردن و هەردووکیانی کوشت، وەپێستەکانیانی دەرهێناو لاشەکانیانی لەو شوێنەدا بەجێ هێشت. کەشێرەکە هاتەوەو ئەو کارەساتەی دی وەك مار پێچی ئەخواردوو هاواری ئەکرد وئەی نەڕاند کەئەو دۆڵە بەجارێك دەنگی ئەدایەوە. لەودارستانەدا چەقەڵێك هەبوو کەگوێی لەو هاوارەبوو هاتەلای و پێی ووت: ئەوە چیت لێ قەوماوە؟

شێرەکە کارەساتی بەتەواوی بۆگێڕایەوە. چەقەڵ ووتی:

ئەگەر تۆ لەوەوپێش کاری وات لەگەڵ کەسی تردا نەکردایە ئەم کارەساتەت بەسەردا نەئەهات. خەفەت مەخۆ وەك ئەوان ئارامیان گرت لەکاری تۆ، تۆش ئەبێ ئارام بگری. زاناکان ووتوویانە:

هەر وەك وەریئەگری لێشت وەر ئەگیرێ، وەهەموو کارو کردەوەیەك پاداش و سزای بەپێی خۆی بۆدانراوە لەزۆر هەتا کەم، وەك دەغڵ کەلەسەر ئەندازەی تۆوی بەر ئەدا.

شێرەکە ووتی: بەڕاستی تێم بگەیەنەو ئەم قسانە مانایان چییە؟ چەقەڵ ووتی: تەمەنت چەندە؟ شێرەکە ووتی: (سەد ساڵ).

چەقەڵ ووتی:

خواردنت چییە؟ ووتی: گۆشتی گیانەوەر.

ووتی: کێ بۆتی ئەهێنێ؟ ووتی: خۆم ڕاویان ئەکەم.

چەقەڵ ووتی:ئەوگیانەوەرانەی کەتۆ ئەیانکوژیوئەیانکەی بەخۆراك ئایا باوكودایکیان نەبووە؟ ووتی: بەڵێ هەیانبووە. چەقەڵ ووتی: ئەی بۆ نایانبینم کە دایكوباوکی ئەوان وەك تۆ هاوارو ناڵین بکەن بۆ بەچکەکانیان؟! بزانە ئەوەی بەسەرتاهات هەمووی ئەنجامی خراپەو تاوانی خۆتە کە بەرۆکی گرتی.

کاتێ کەشێرەکە ئەوەی لە چەقەڵ بیست تێگەیشت کەکاری ئەو هەمووی جەورو ستەمە وەبەهۆی ئەوەوەبوو کەبەچکەکانی لەدەستدا.

ئیتر بەجارێك وازی لەڕاوکردن هێناو دەستی کرد بەخواردنی میوەو بەری درەخت، وەکەوتە نوێژکردن و خواپەرستی.

کاتێ (کۆترێك)کەخاوەنی ئەوبێشەیە بوو، وەخۆراکی بەری درەخت بوو ئەوەی چاوپێکەوت پێی ووت: من وامئەزانی کەئەم ساڵ درەخت لەبەر کەم ئاوی و بێ بارانی باش بەری نەگرت، بەڵام کەتۆم دی بەری

درەخت ئەخۆی، وەتۆ گۆشت خۆری، بەڵام وازت لەو خواردنە هێناوە کەخوا بۆی داناوی، وەبەشی کەسانی تر ئەخۆی زانیم کەدرەخت بەهۆی تۆوە بوو باش بەری نەگرت.

قوڕبەسەردرەخت و بەری درەخت و ئەو قوڕبەسەرانەی کەژیانیان لەسەر بەری درەختە چەندزوو لەناوئەچن ئەگەر ئەوکەسانە بێنە سەریان کەمافیان پێوەنییە. کاتێك شێرەکە ئەوەی لەکۆترەکە بیست، وازی لەخواردنی میوەو بەری درەختیش هێناو کەوتە سەرخواردنی پوش‌وگیا، وەخواپەرستی کردن.

لە بەر ئەوە ئەم پەندەم بۆ ووتی کەبزانی مرۆڤی بێ مێشك دوورنییە کەبەهۆی کارەساتی خۆیەوە واز لە ئازاردانی مرۆڤ بێنێ وەك ئەو شێرەی کەبەهۆی کوژرانی بەچکەکانییەوە وازی لەڕاوکردنی نێچیر هێناو کەوتە خواردنی بەری درەخت وەلەوەش وازی هێنا لە بەر قسەی (کۆتر) وەهاتە سەر نوێژو خواپەرستی. وەلەمەدا ئادەمیزاد لەپێشترن سەیری ئەوکارە بکەن، چونکە پێشینان ووتوویانە: ئەوەی خۆت ناتەوێ دەربارەی کەسانی تر مەیکە، چونکە لەمەدا [1] داد پەروەری هەیە. وەلەداد پەروەریدا ڕازیبوونی خواو ئادەمیزاد هەیە.

*** *** ***

**دەرگای**

**(شێرو ڕاوکەرو چەقەڵ)**

**تەواو بوو**

---

[1] داد پەروەری= عەدالەت

# دەرگـــــای

# ( خـــوا پەرســـت و مـــیوان )



(دەبشەلیم) پادشای هیند ووتی بە (بەیدەبای فەیلەسووف):ئەو پەندەم بیست، ئێستا پەندی ئەو کەسەم بۆ بڵێ کەواز لەو کارە دێنێ

کەلەگەڵیدا ئەگونجێ و بەکاری دێ و بەدەستییەوە ئاسانە وە شوێن کارێکی تر ئەکەوێ کەنایزانێ. لەپاشا دوودڵ و سەر لێشێواو ئەبێ.

فەیلەسووفەکە ووتی:

ئەگێڕنەوە لەخاکی(کەرخ)دا (خواپەرستێك)هەبوو. ڕۆژێك میوانێکی هات خواپەرستەکە خورماوڕۆنی بۆکرد، وەبەیەکەوە نانیان خوارد.

میوانەکە ووتی: ئەم خورمایە چەندخۆشە. داخەکەم خورما لەووڵاتی ئێمەدا نییە خۆزگە هەبووایە.

لەپاشا ووتی: حەز ئەکەم یارمەتیم بدەی کەهەندێ نەمامی خورما لەگەڵ خۆمدا بەرمەوە بۆ ووڵاتی خۆمان، چونکە من شارەزای دارو خاکی ئێوەنیم. (خواپەرستەکە) پێی ووت: ئەمە بەکاری تۆنایەو کارێکی گرانە، لەوانەیە کەلەخاکی ئێوەدا خورما نەڕوێ. ووڵاتی ئێوە دارو میوەی زۆرە ئیتر دار خورمای بۆچییە؟

لەگەڵ ئەوەدا کە(خورما) بێکەڵكو ناسازە بۆلەش. لەپاشان خواپەر ستەکە ووتی: ئەو کەسە ژیرنییە کەبەشوێن شتێکدا ئەگەڕێ کەدەست ناکەوێ، وەتۆ بەختیاری ئەگەرکارێك بگریتەدەست کەدەستت بەسەریا بڕوا و واز لەو کارە بێنی کەسەختەو بۆت دەستگیر نابێ.

ئەو خواپەرستە بەزمانی[1] عیبری قسەی ئەکرد. میوانەکە سەری لەقسەکانی سوڕمابوو. وەزۆر بەلایەوە زمانێکی سەیروجوان بوو ،ویستی کەفێری ببێ. چەند ڕۆژێك خەریکی ئەوە بوو. خواپەرستەکە پێی ووت: بەم جۆرە کەوازت لە زمانی خۆت هێناوە و ئەتەوێ کەزمانی عیبری فێر ببی دوور نییە کەوەکو قەلەڕەشکەت بەسەردانەیە. میوانەکە ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ خواپەرست ووتی:

ئەگێڕنەوە قەلەڕەشکەیەك چاوی بەرۆیشتنی کەوێك ئەکەوێ، سەری سوڕ ئەمێنێ ئەیەوێ کەفێری ببێ. دەست ئەکا بەمەشق کردن و خۆڕاهێنان، بەڵام بۆی ناکرێ، وە لەپاشان وازی لێ دێنێ و ئەیەوێ بگەڕێتەوە سەر ڕۆیشتنەکەی خۆی. سەیر ئەکا ناتوانێ و قاچی تێکەڵ ئەبێ وەلەئەنجامدا ئەبێ بەناشرینترینی هەموو باڵندەیەك لەڕۆیشتندا.

لەبەر ئەوە ئەم پەندەم بۆ ووتی: کەسەیرم کرد وازت لەزمانی خۆت هێناوە، ئەو زمانەی کەلەسەری پەروەردەکراوی و زمانی بنەچەیی خۆتە. وەئەتەوێ فێری زمانی عیبری ببی کەلەگەڵ تۆدا ناگونجێ. ئەترسم کەفێری نەبی و زمانەکەی خۆشت لەبیر بچێتەوەو بەزمانێکی چەوت و ناشرینەوە بگەڕێیتەوە ناوهۆزو کەسووکارت. چونکە

---

[1] عیبری- زمانی جولەکەیە

پێشینان ووتوویانە: ئەو کەسە گەوج و نەزانە کەشوێنی کارێك ئەکەوێ کەلەگەڵیدا ناگونجێ و کاری ئەو نییە، وەلەگەڵ شان و پایەی ئەودا ڕێ ناکەوێ و باوك و باپیری لەوەو پێش نەیانکردووەو پیشەیان نەبووە.

**** **** ***

**دەرگای**

**(خواپەرسـت و میوان)**

**تەواو بوو**

# دەرگـــای

# (جیـــهانگەڕو زەڕەنـــگەر)



(دەبشەلیم) پادشای هیند ووتی بە(بەیدەبای فەیلەسووف): ئەوپەندەم بیست، ئێستا پەندێکم بۆ باس بکە لە بابەت ئەو کەسەوە کەچاکە لە شوێنی خۆیدا ناکا، وەلەوەدا بەتەمای پاداش وچاکەیە.

فەیلەسووفەکە ووتی: ئەی پادشا ڕەوشتی زیندەوەر جیاوازە. هیچ زیندەوەرێکیش لەباڵندەی ئاسمان وچوارپێی سەرزەوی و زیندەوەرانی دەریا لە مرۆڤ چاکتر نییە. بەڵام لە مرۆڤدا چاك و خراپ هەیە، هەندێ جار گەلێ دڕندەو باڵندەو گیانەوەرانی کێوی لە مرۆڤ دڵسۆزترن، وەزیاتر سوپاس ئەکەن، وەچاکتر پاداشی چاکە ئەدەنەوە. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر تێگەیشتوان کەچاکە لە شوێنی خۆیدا بکەن.

وە لەگەڵ کەسێکدا نەیکەن کەمانای چاکەو پیاوەتی نەزانێ و سوپاسی نەکا، مرۆڤی ژیر هەرگیز نابێ دۆستایەتی تەواو لەگەڵ کەسێکدا ببەستێ لە پاش تاقیکردنەوەو زانینی تەواونەبێ هەتا تێبگات کە بەکاری دۆستایەتی و هاوڕێیەتی دێت، وەچاکەی لە پێش چاوە یان نەء ؟ وەنابێ لەوەدا سەیری خزم و کەس و کار بکات، لە کاتێکدا کەبەکاری چاکە نەیەن، وەدەست لە بێگانە هەڵنەگرێ کەمانای چاکەو پیاوەتی بزانێ و خۆی لەڕێی دۆستایەتیدا بەخت بکات. ئیتر ئەو کاتە ئەزانێ کەپاداشی چاکە بداتەوەو سوپاسی بکا، وەپیاو چاك و دڵسۆز ئەناسرێ، وەبەڕاستگۆوکردەوەی تەواو ناودەرئەکا، وەهەر کەسێکی تریش کەبە ڕەوشتی بەرز ناسرابێ وەجێگەی باوەڕی گشتی بێ، ئەویش پیاوەتی خۆیەتی و مافی چاکەی هەیە.

پزیشکی شارەزا ناتوانێ دەرمانی نەخۆش بکا هەتا سەیری نەکاو نەیپشکنێ دەستی لێ نەداو شارەزای ڕەوشتی نەبێ، وەبەتەواوی هۆی ناساغیەکەی نەزانێ. کەئەوانەی هەمووزانی ئینجا دەست ئەکا بەدەرمانکردنی. وەبەو جۆرە مرۆڤی تێگەیشتوو نابێ لە خۆیەوە هاوڕێیەك هەڵبژێرێ و بیکا بەدۆستی ڕاستقینەی خۆی کە ئەوکاتە دوو، نییە تووشی ترس و سەختی و لە ناو چوون ببێ. لە گەڵ ئەوەشدا ڕەنگە پیاو چاکە لەگەڵ کەسێکی هەژاری داماودا بکا کەهێشتا ڕەوشتی تاقی نەکردبێتەوە، چاکترین پاداش و چاکە بداتەوە. وەچاکترینی سوپاسی ئەوکەسە بکا. وەڕەنگە پیاوی ژیر باوەڕی بەکەس نەبێ، وە لە هەموو کەس خۆی بپارێزێ. مرۆڤ هەیە (سمۆرە) ئەگرێ و ئەیخاتە قۆڵی کراسەکەیەوە، بەڵام لەقۆڵەکەی تریەوە بێدەنگ دەربازی ئەکا وەك ئەوەی کەباڵندە لەگەڵ خۆیدا هەڵئەگرێ و ڕاوی پێ ئەکا و نانی لێ ئەخوا، وەهەر لەوەش خۆراکی باڵندەکەش ئەدا.

زاناکان ووتوویانە: مرۆڤی ژیر نابێ ڕق و کینە دەربارەی کەس بەکار بهێنێ، وەنابێ گەورەو بچووك لەئادەمیزاد و گیانەوەر بڕەنجێنێ، بەڵکو ئەبێ تاقیان بکاتەوەو سەیری خوو ڕەوشت و کردەوەیان بکات، وە لەگەڵ هەریەکە لەواندا بەپێی خۆی بجوڵێتەوە و ڕەفتاربکات، وەلەمەدا مرۆڤانی تێگەیشتوو سەرگوزشتەیەکیان بۆپەندوو ئامۆژگاری ووتووە. پادشا ووتی: ئەوەچۆن بووە؟

(بەیدەبا) ووتی:

ئەگێڕنەوە (پیاوێکی جیهانگەڕ) لە کاتی گەڕاندا چاوی بە (بیرێك) ئەکەوێ و سەیری ئەکا ئەبینێ کەپیاوێك و مارێك و مەیمونێك و بەورێکی[1] تیادایە. بڕیار ئەدا کەئەو پیاوە لەناو ئەو دوژمنانەدا دەرباز بکات. گوریسێك دێنێ و فڕێی ئەداتە ناو بیرەکەوە. مەیمونەکە دەست بەجێ خۆی بەگوریسەکەدا هەڵئەواسێ وەلەبەر سووکی لەشی دێتە دەرەوە. جیهانگەڕ دووبارە گوریس فڕێ ئەدا مارەکە خۆی پێوە ئەپێچێ و دەرباز ئەبێ، لەجاری سێ یەمیشدا (بەورەکە) خۆی پیادا هەڵئەواسێ. جیهانگەڕ ناچار ئەویش لەناو بیرەکەدا دەردێنێ، زۆرسوپاسی ئەکەن. لەپاشان پێی ئەڵێن، ئەو پیاوەی ناو ئەم بیرە دەر مەهێنە، چونکە هیچ شتێك وەك ئادەمیزاد سپڵە نییە، بەتایبەتی ئەم کابرایەی کەئێمە ئەیناسین و لە بیرەکەدا هاوڕێمان بووە.

لە پاشا مەیمونەکە پێی ووت: من ماڵم لەشاخێکدایە نزیك شاری (نەودرەخت) بەورەکەش ووتی: منیش لەبێشەیەکی نزیك ئەو شارەدام. مارەکەش ووتی: منیش لە کونێکی ناو شوورای ئەو شارەدا ئەژیم، ئەگەر تۆ ڕۆژێك لەڕۆژان ڕێت کەوتە ئەو شوێنە و پێویستیەکت هەبوو هاوار بکە هەتا ئێمە بێین و چاکەت بدەینەوە. لە پاشان لێی جیا بوونەوە. جیهانگەڕەکە گوێی نەدا بەقسەکانیان وەگوریسەکەی فڕێدایە ناو بیرەکەوەو کابرای ڕزگار کرد.

---

[1] بەور- درندەیەکە لەشێر ئەچێ

ئەویش دەستی ماچ کردوو ووتی: من کابرایەکی زەڕەنگەری گەورەی شاری (نەودرەختم). ئەگەر هاتی بۆئەویٚ پرسیاری ماڵی ئێمە بکە هەتا چاکەت بدەمەوە.

وارێك کەوت ئەو (جیهانگەڕە) ئیشێکی کەوتە ئەو شارە. کەلێی نزیك بووەوە مەیمونەکە چاوی پێ کەوت و ناسییەوە، هات سەری خستە سەرزەوی و قاچی ماچ کرد و ووتی: مەیمون هیچیان نییە، بەڵام لێرەدا دابنیشە ئێستا دێمەوە. مەیمونەکە هاتەوەو میوەیەکی نایابی بۆ هێناو لەبەردەمیدا داینا. لە پاشان جیهانگەڕەکە ڕۆیشت کە لە دەرگای شارەکە نزیك بووەوە(بەورەکە)هات بەپیریەوەوخۆی لەبەرپێیدا دا بەزەویداو ووتی: تۆ چاکەیەکی گەورەت بەلای منەوە هەیە، تۆزێك ئارام بگرە ئێستا دێمەوە. بەورەکە چوو لەدیواری ماڵی پادشاوە چووە سەرو کچەکەی کووشت و هەموو خشڵ و ئاڵتوونەکانی بردوو هێنای لەبەر دەستی جیهانگەڕەکەدا داینا، جیهانگەڕەکەش نەیزانی کەئەمەی لە کویٚ بۆهێنا. لەدڵی خویدا ووتی: ئەم گیانەوەرانە ئەمە چاکەو پاداشتیان بێ، ئەبێ زەڕەنگەر چۆن بێ؟ خۆئەگەر هیچیشی نەبێ ئەم خشلآنەم بۆئەفرۆشێ ئەو چاکتر لە نرخیان ئەزانێ.

(جیهانگەڕەکە) هاتەناو شارو بەپرسیار ماڵی کابرای (زەڕەنگەر)ی دۆزیەوە، لەپاش حەسانەوە کەخشڵەکانی نیشاندا ناسییەوە کەئەمە خشڵی کچی پادشایە،چونکە خۆی بۆی درووستکردبوو. بەجیهانگەڕە کەی ووت: دابنیشە هەتا ئەچم لەبازاڕ خۆراکت بۆدێنم، چونکە ئێستا

خۆراکی ماڵەوە بەباش نازانم (زەڕەنگەر)چووە دەرێ لەدڵی خۆیدا ووتی: هەلێکی چاکم دەست کەوت ئەچم پادشا ئاگادار ئەکەم ئیتر لای ئەو بەرز ئەبمەوە.

چوو بۆ قاپی پادشاو ئاگاداری کرد کەئەوەی کچەکەی کوشتووە و خشڵەکانی بردووە لای منە.

پادشا دەستبەجێ سەربازی ناردوو جیهانگەڕیان بەدەست بەستراوی لەماڵی (زەڕەنگەر) هێنایە دەرێ.

کەپادشا خشڵەکانی چاو پێکەوت هیچ ماوەی نەدا فەرمانیدا لەپاش سزای زۆر بیدەن لەسێدارە.

کاتێک بەناو شاردا ئەیانگێڕا و سزایان ئەدا هاواری ئەکرد و ئەی ووت: ئەگەر قسەی ماروو گیانەوەرەکانم لەگوێ بگرتایە لەبابەت سپڵەیی مرۆڤەوە ئێستا بەم دەردە گرفتار نەئەبووم.

جیهانگەڕەکە ئەم قسەیەی چەند جارێك بەدەنگی بەرز کردەوە، هەتا مارەکە گوێی لێبوو. لەکونەکەی خۆی هاتە دەرێ و کابرای ناسی زۆری پێناخۆشبوو. ڕایکرد خۆی کرد بەماڵی پادشادا وەدای بەکوڕەکەیەوە.پادشا(پزیشك)نەما بانگی نەکا بێسوودبوو، کوڕەکەی هەر بێهۆش بوو، لەپاشان مارەکە خوشکێکی هەبوو کە (جنۆکە) بوو، چوو بۆلای وەسەرگوزشتەی پیاوەتی (جیهانگەڕەکە)ی بۆگێڕایەوە. خۆشکی مارەکە زۆر دڵی پێ سووتا، شەو چووە خەوی کوڕی پادشاو پێی ووت:

تۆچاك نابیتەوە هەتا ئەو جیهانگەڕەی کە بەزۆرداری گرتووتانەو سزای ئەدەن چاکت نەکاتەوە. مارەکەش بەدزییەوە چووە لای جیهانگەڕەکە لەبەندیخانەکەدا و پێی ووت: ئەگەر هاتن بەشوێنتا کە کوڕی پادشا دەرمان بکەی ئاوی ئەم گەلایەی کەبۆم هێناوی بدەرێ کەبیخواتەوە چاك ئەبێتەوە.

وەپادشا هەر پرسیارێکی لێکردی ڕاست برۆ، ئیتر ڕزگارت ئەبێ.

بەیانی کوڕە پادشا باوکی لەو قسەیەی کە خوشکی مارەکە پێی ووت ئاگادار کرد. پادشا ناردی جیهانگەڕیان لەبەندیخانە دەرهێنا، وەفەرمانی پێدا کەکوڕەکەی تیمار بکا. جیهانگەڕەکە لەئاوی گەڵاکەی دا بەکوڕە پادشا. کەخواردیەوە خێرا چاك بووە وە.

پادشا زۆر دڵی خۆشبوو وەپرسیاری لە جیهانگەڕەکە کرد ئەویش بەسەرهاتی خۆی بەتەواوی بۆگێڕایەوە. پادشا زۆر سوپاسی کرد، وەخەڵاتی زۆر بەنرخی کرد. لە پاشا فەرمانیدا کە(زەڕەنگەرەکە) بدەن لەدار. (زەڕەنگەر)یان کوشت لەبەر ناپاکی و چەوتی و لادان لەسەر ڕێی چاکەو سوپاس.

لەپاشان فەیلەسووفەکە ووتی بەپادشا: لەکردەوەی بەدی(زەڕەنگەر) دەربارەی(جیهانگەڕ)لەپاشی چاکەوپیاوەتی ورزگارکردن،وەسووپاسی گیانەوەرەکان وخۆبەختکردنی هەندێکیان لەپێناوی چاکەو دۆستایە تیدا، ئامۆژگاری هەیە بۆگوێگران، وەپەندهەیە بۆتێگەیشتوان، وە زانینە بۆ ڕۆشنبیران. وەڕێگا نیشان ئەدا بۆکردنی چاکە لە شوێنی

خۆیدا، نزیك بێ یان دوور، خزمبێ یان بێگانە، چوونکە ئەمە ڕێیەکی ڕاستە، چاکە ڕائەکێشێ و خراپە دوور ئەخاتەوە.

*** *** ***

دەرگای

(جیهانگەڕو زەڕەنگەر) تەواو بوو

# دەرگـــــای

## (كوڕە پادشـــا و هـــاوڕێــكانی)



(دەبشەلیم) پادشای هیند ووتی بە(بەیدەبای فەیلەسووف): ئەو پەندەم بیست، ئێستە پێم بڵێ ئەگەر پیاو بەهۆی ژیری و كۆشش و ئارامگرتن و زانینەوە تووشی چاكە ببێ وەك ئەڵێن، ئەی بۆچی پیاوی

نەزان تووشی گەورەیی و بەرزی ئەبێ، وەپیاوی زانای تێگەیشتوو لە ناخۆشی و سزادا ئەتلێتەوە؟ (بەیدەبا) ووتی: ئەی پادشا بزانە کە مرۆڤ بەهۆی چاویەوە ئەبینێ وەبەهۆی گوێ یەوە ئەبیستێ. بەو جۆرەش کارو بار پێویسیتی بە ئارام گرتن و کۆشش و ژیری هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا هەر ڕۆژگار بەسەر ئەودا زاڵە، وەبەئارەزووی خۆی ئەی گێڕێ، بۆڕاستی ئەمەش سەر گوزشتەی(کوڕە پادشاو هاوڕێکانی) هەیە پادشا ووتی: ئەوە چۆن بووە؟

فەیلەسووفەکە ووتی:

ئەگێڕنەوە چوارکەس لە ڕێیەکدا ئەبن بەهاوڕێ کەئەمانە بوون.

کوڕە پادشا، کوڕە بازرگان، کوڕە جوتیار وەکوڕە خانەدانێکی جوان. هەرچواریان لەخاکی بێگانەدا لێ قەوماو، وە تووشی ترس و سەختییەکی زۆر ئەبن وە لە جلی بەریان زیاتر هیچیان پێ نابێ. لەو کاتەدا کەبەیەکەوە ئەڕۆن قسە لە(بنەچە)و سروشتی خۆیان و دەستکەوتی چاکەیان ئەکەن. کوڕە پادشا ئەڵێ کارو باری جیهان هەمووی بەدەست ڕۆژگارەوەیە، ئەوەی ئەو بۆ ئادەمیزادی داناوە بەهەر جۆرێك بێت هەرپێی دەگات وەئارامگرتن لەسەر کاری ڕۆژگار لەهەموو شتێك چاکترە، کوڕە بازرگانیش ئەڵێ: نەخێر ژیری لەهەموو شتێك باشترە.

کوڕە خانەدانیش ئەڵێ: جوانی لەو شتانەی کەئێوە ئەڵێن چاکترە و بەنرخ ترە.

کوڕە جوتیاریش ووتی: لەجیهاندا هیچ شتێك نییە وەك هەوڵ و کۆشش بۆکردنی کاروبار. لەپاشا لەشارێك نزیك بوونەوە کەپێیان ئەووت(مەتروون) لەشوێنێك دانیشتبوون کەزۆریان برسی بوو. بەکووڕە جووتیاریان ووت: برۆ بەهەوڵ و کۆششت خۆراکی ئەمڕۆمان بۆپەیدا بکە. کوڕە جوتیار چوو بۆناو شار لەوێ پرسیاری کارێکی کرد

کەخواردنی چوارکەسی پێ پەیدا بکات. پێیان ووت: لەم شارەدا دار لە هەموو شت زیاتر بایەخی هەیە. داریش یەك(سەعات)ڕێ لەشارەوە دووربوو ڕۆیشت لەوێ یەککۆڵ داری باشی هێناو دای بەدرەمێك، وەخواردنی چوارکەسی پێ کڕی و لەدەرگای شارەکەی نووسی: کاری گرانی یەك ڕۆژ، نرخەکەی یەك درەمە.

ڕۆژی دوایی بەکووڕە جوانەکەیان ووت: ئەبێ نۆرەی تۆبێ بزانین بەهۆی جوانییەوە چی ئەکەی؟ ئەویش هەستاو ڕۆیشت. لەدڵی خۆیدا بڕیاریدا کەلێیان جوێ ببێتەوە، چونکە هیچ کارو فرمانێکی نەئەزانی. چوو پاڵیدا بەدرەختێکەوە. خەوی لێ کەوت، پیاوێك لەگەورەکانی شار بەلایدا تێپەڕی وە لەجوانییەکەی سەری سوڕما. وەبەگەورەو خانەدانی هاتە بەرچاو. زۆر بەزەیی پیادا هاتەوە. لە بەر ئەوە گەڕایەوەو (پێنج سەد) درەمی پێ بەخشی ئەویش لێی وەرگرت، وە لەدەرگای شارەکەی نووسی: جوانی یەك ڕۆژ، بەرامبەر پێنج سەد درەمە. وەپارەکەی هێنایەوە بۆ هاوڕێکانی. ڕۆژی سێیەم نۆرەی کوڕە بازرگان بوو کەبەژیری و بازرگانی شتیان بۆ پەیدا بکات، کوڕە بازرگان ڕۆیشت هەتا چاوی کەوت بەکەشتییەکی گەورە کەپڕبوو لەکوتاڵ. وەلەکەناری ڕووباردا ڕاوەستابوو. کۆمەڵێك بازرگانی بۆدەرچوو، وەلەنزیکیەوە دانیشتن، بەیەکتریان ئەووت: هەرچەندە زۆریش پێویستیمان بەو کوتاڵە هەیە،بەڵام ئەمڕۆ ئەگەڕێینەوەو هیچیان لێ ناکڕین، ئەمێنێتەوەو بەناچاری هەرزانی ئەکەن. کوڕە بازرگان خێرا لەلایەکی ترەوە چوو بۆلای خاوەنی کوتاڵەکەو هەرچیەکی تیادابوو کڕی (بەسەد هەزار)دینار کەلەپاش ماوەیەکی کەم پارەکەیان بداتێ. وەبەجۆرێك خۆی نیشاندا کەئەیەوێ کوتاڵەکە ببابۆشارێکی تر، وە لەوێ بیفرۆشێ کاتێك بازرگانەکان ئەوەیان بیست زۆر ترسان کەئەو کوتاڵەیان لە دەست بچێ. لە بەر ئەوە هاتن لەسەر ئەو نرخەوە(سەد هەزار درەم)

قازانجیان دایەوە. ئەویش لێی وەرگرتن و سەدهەزار دینارەکەی دایەوە دەست خاوەنی کەشتییە کوتاڵەکە. وەسەد هەزار درەمەکەشی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆلای هاوڕێکانی. وەلەدەرگای شارەکەی نووسی: ژێری تاقە یەك ڕۆژ، نرخی سەدهەزار درەمە.

ڕۆژی چوارەم بەکوڕە پادشایان ووت: تۆش بڕۆ بەکاری ڕۆژگارت شتێك پەیدا بکە. کوڕە پادشا ڕۆیشت هەتا گەیشتە بەر دەرگای شارەکە و لەوێدا دانیشت. واڕێککەوت کەپادشای ئەو ناوچەیە مردبوو، وەکەسی لەپاش بەجێ نەمابوو. تەرمی پادشایان هێنا. ئەم لەجێی خۆی هەڵ نەسا. دەرگاوانی شارەکە لەوێدا دەری کرد. لەپاش ناشتنی پادشا کەگەڕانەوە ئەم هەر لەوشوێنەدا دانیشتبۆوە، دەرگاوانەکە زۆر تووڕەبوو گرتی و بردی بۆبەندیخانە.

کەڕۆژ بۆوە دانیشتوانی شارەکە کۆبوونەوە، کەیەکێك بکەن بەپادشا، هەرچەندیان ئەکرد نەیان ئەزانی کێ هەڵبژێرن وەکێ ماف پادشایەتی هەیە. لەپاشا دەرگاوانەکە ووتی: دوێنێ کوڕێك لەدەرگای شاردا دانیشتبوو هیچ خەفەتی نەئەخوارد بۆمردنی پادشا وەلەجێی خۆی هەڵ نەئەسا منیش لەوێدا دەرمکرد کەچی کە هاتینەوە هەر لەوێدادانیشتبوو، منیش خستمە بەندیخانە. گەورەکانی شار ناردیان کوڕەکەیان هێناو لێیان پرسی کە کێیەو بۆچی هاتووە بۆ ئەو شارە؟ ووتی: من کوڕی پادشا(فەویرانم) کە باوکم مرد براکەم لەسەر تەخت زاڵبوو بەسەرما. منیش لەترسی گیانی خۆم ڕامکرد هەتا گەیشتمە ئەو دارستانە، کاتێ ئەوقسانەی کرد چەند کەسێك لەوان کەووڵاتی باوکیان دیبو ناسییانەوە وزۆر ستایشی باوکیان کرد. لەپاشا گەورەکانی شار بڕیاریاندا کەببێ بەپادشایان وەهەروەك ڕەوشتی خۆیان پادشای تازەیان سواری فیلێکی سپی کرد وەبەدەوری شاردا ئەیانگێڕا. کەچاوی بەنوسراوە کانی سەر درگاکە کەوت. فرمانیدا کە بنوسن:

هەوڵدان بۆجوانی وژیری وەهەموو سود و زیانی جیهان گشتی کاری ڕۆژگارن. لەپاشا لەسەر تەخت لێی دانیشت وەناردی بەدوای هاوڕێیەکانیدا. لەپاشا ژیرەکەیانی کرد بەوەزیر. وەئیشکەرەکەی کرد بەخاوەنی زەوی‌و زار. وە پارەیەکی زۆریدا بەکوڕە جوانەکەو لەپاشا دووری خستەوە بۆ ئەوەی کەبەهۆی ئەوەوە توشی گیروگرفت‌و ئاژاوەنەبێ.

لەپاشا زاناو تێگەیشتوی ئەو شارەی کۆکردەوەو ووتی: هاوڕێکانی من بەتەواوی بۆیان ڕونبۆوە کە(ڕۆژگار)کاری گەورەئەکا ئەمەوێ کەهەمو لایەك تێبگەیەنم کەئەم پایە بەرزەی من بە هۆی جوانی و ژیری و کار کردنەوە نەبوو. من کە براکەم دەری کردم بەهیوای ژیانی خۆم نەبووم نەخوازە پادشایەتی، وەلەم خاکەدا لەمن ژیرترو جوانترو ئیشکەر تر هەبوو، بەڵام ڕۆژگار پاڵی بەمنەوەنا بۆ گەورەیی و شانازی.

لەو کۆمەڵەدا پیاوێکی پیر هەستاو ووتی: قسەکانت زۆر بەجێن، وە پڕن لەزانین و تێگەیشتن. وەئەوەی کەدەستت کەوت مافی خۆت بوو. چونکە لەهەموکەس چاکترو بەختیارتر ئەو کەسەیە کەخاوەنی ژیری وبیرکردەوە بێ.

لەپاشا پیاوێکی پیری تر هەستا کە(جیهان گەڕ)بوو ووتی: من بەمناڵی نۆکەری پیاوێکی دەوڵەمەند بووم، کەگەورەبووم وازم لەجیهان هیناو لای کابرا دەر چووم، ئەویش لە ڕۆژانەی خۆم دودیناری دامێ، منیش بڕیارمدا کەیەکێکیان لەڕێی خوادا بدەم، وەئەوی تریشم پێ بێ. لە بازاڕدا سەیرمکرد ڕاوکەرێك جوتێك (پەپوو سلێمانکە)ی[1] پێ بوو. ویستم کەبەدینارەکە بیان کڕم و بەریان بدەم، بەڵام کابرا داوای دودیناری لێ ئەکردن. زۆر هەوڵم لەگەڵدا بەڵام بێسوود بوو. ویستم

---

[1] پەپوو سلێمانکە- ناوی باڵندەیەکە

کەیەکێکیان بکرم ئەوی کەیان واز لێبێنم. بەڵام ترسام کەجوتەی (نێرو مێ) بن، وەبەو کارە لەیەکیان بکەم. زۆر بەزەییم پیادا هاتنەوە، پشت بەخوا هەردووکیم کڕی بەدودینارەکە، وەبردنم زۆرلەشوێنێکی زۆردوور لەئاوەدانی وەخاوەن دارو سەوزەگیادا بەرمدان. فڕین و بەسەر دارێکەوە نیشتنەوە. زۆر سوپاسیان کردم و ووتیان: لەبنی ئەم دارەدا کوپەڵەیەکی پڕ لەئاڵتوون هەیە دەری بێنە بۆخۆت. منیش ووتم: ئێوە چۆن گەنجینەی ئاڵتوونی ژێرزەوی نیشانی من ئەدەن، وەخۆتان لەئاستی داوی ڕاوکەردا کوێرن. ووتیان: (ڕۆژگار) کەڕۆژی تەواو کرد چاو لەئاستی ڕزگایدا کوێر ئەکا. ئێمە لەئاستی داودا کوێرین کاری ڕۆژگارە، بەڵام چاومانی بەرامبەر بەو ئاڵتوونە تیژکردووە.

منیش چوم لەبنی ئەو دارەدا کووپە ئاڵتوونەکەم دەرهێناو پێم ووتن: سووپاس بۆئەو خوایەی کە ئاگاداری شتێکی کردن کەلەوە بەر لێی ئاگادر نەبوون. ئێوە بەئاسماندا ئەفڕن قسە لەناخی زەوی ئەکەن. ووتیان: ئەی پیاوی ژیر بۆچی نازانی کە(ڕۆژگار) بەسەر هەمووشتێکدا زاڵە، وەهیچ شتێك ناتوانێ لە فەرمان دەرچێ؟

ئەی پادشای بەڕێز من ئەوەم دی کەبۆم گێڕانەوە، ئەگەر پادشا ئارەزوو ئەکا ئەچم ئەو کوپەڵە پڕ لەلیرەیەی بۆدێنم و ئەیخەمە ناو گەنجینەکانییەوە.

پادشا ووتی: بەزیادبێ، ئەوەهەر بۆتۆو پیرۆزی تۆبێ.

*** *** ***

دەرگای

(کورە پادشاو هاوڕێکانی) تەواو بوو

# دەرگــــــای

# (کــــۆتر و ڕێـــوی و شیـــنە شــاهـــو)



ئەمە دەرگای ئەو کەسەیە کە ڕێگا بۆکەسانی تر دائەنێ، بەڵام بۆ خۆی هیچی لەدەست نایە. (دەبشەلیم)پادشای هیند ووتی بە

(بەیدەبای فەیلەسووف) ئەو پەندەم بیست ئیستا پەندێکم بۆبڵێ لەبابەت ئەوپیاوەی کە ڕێگەو چارە بۆکەسانی تر ئەدۆزێتەوە، کەچی بۆخۆیشی هیچی لەدەست نایە.

فەیلەسووفەکە ووتی: پەندی ئەوە سەرگوزشتەی(کۆترو ڕێوی و شینەشاهۆ)یە. پادشا ووتی: ئەوە چۆن بووە؟ فەیلەسوفەکە ووتی: ئەگێڕنەوە کۆترێك هێلانەیەك لەسەر دارخورمایەکی زۆر بەرز درووست ئەکا. وەبەسزایەکی قورس پووش و پەڵاش ئەباو ئەیخاتە ژێر هێلکەکانی لەبەر بەرزی دارخورماکەو دووری هێلانەکەی لەزەوییەوە لە پاش (کڕکەوتن) و بەچکە هەڵهێنان (ڕێوی یەك) کەلەوە پێش پێی فێر بووە کاتی بەچکەکردنی ئەزانێ دێت ولەبن دارەکە ڕائەوەستێ و هەڕەشەی لێ ئەکا کەبەچکەکانی بۆفڕێ بداتە خوارێ، ئەگینا سەر ئەکەوێتە سەر دارخورماکەو خۆیو بەچکەکانیشی ئەخوا. ئەویش لەترسی خۆی بەچکەکانی بۆفڕێ ئەدا، ڕۆژێك کەدوو بەچکەی هەڵهێنابوو، ڕێکەوت (شینەشاهۆیەك) بەسەر دارەکەوە نیشتەوە. لەو کاتەدا کۆترەکە بەدیار بەچکەکانییەوە ئەگریا. شینەشاهۆ لێی پرسی: ئەی کۆتر بۆچی وا زویری و ڕەنگت تێك چووە؟ کۆترەکە بەسەر هاتی بۆگێڕایەوە.

(شینەشاهۆ) ووتی: ئەگەر ئەم جارە هات پێی بڵێ بەچکەکانت بۆفڕێ نادەم، ئەگەر ئازای سەر کەوە خۆت بەکوشت بدە ئەگەر تۆ توانیت سەر بکەوی ئەفرم و خۆم لەدەستت ڕزگار ئەکەم ئەوکاتە ئەی بینی کەناتوانێ سەر بکەوێ، ئیتر بۆخۆت لەدەستی ڕزگارت ئەبێ.

کە(شینەشاهۆ) ئەوڕێگەیەی بۆدانا فڕی و لەکەناری ڕوبارێکدا نیشتەوە.

زۆری پێ نەچوو ڕێویەکە هات و لەژێر دارخورماکەدا ڕاوەستا هەروەکوجاران بانگی لەکۆتر کردوو هەڕەشەی خۆی لێ کرد. کۆترەکە پێی ووت: ئەگەرپیاوی سەر بکەوە خۆت بەکوشت بدە.

(ڕێوی) ووتی: پێم بڵێ کێ ئەم قسەیەی فێرکردی کۆترەکە ووتی: (شینەشاهۆ) فێری کردم.

ڕێویەکە هات هەتا لەکاناری ڕووبارەکەدا شینەشاهۆی دۆزییەوە و پێی ووت: ئەی (شینەشاهۆ) چەند پرسیارێکی گرنگم هەیە کەخۆم نایزانم، هاتووم کەتۆ وەڵامم بدەیتەوە. (شینەشاهۆ) ووتی: فەرموو پرسیاربکە.

ڕێویەکە ووتی: ئەگەر ڕەشەبات لای ڕاستت بۆهات سەرت بۆکوێوە ئەکەی؟ (شینەشاهۆ) ووتی: سەر بۆلای چەپم وەر ئەگێڕم.

(ڕێوی) ووتی: ئەی ئەگەر لای چەپتەوە هات؟

ووتی: سەرم بۆلای ڕاستم وەر ئەگێڕم.

ڕێوی ووتی: ئەی ئەگەر ڕەشەبات لە هەموو شوێنێك و هەموو لایەکەوە بۆهات سەرت چی لێ ئەکەی؟

(شینەشاهۆ) ووتی: ئەو کاتە سەرم ئەخەمە ژێر باڵم (ڕێوی) ووتی: چۆن ئەتوانی سەرت بخەیتە ژێر باڵت؟ ئەمە کارێکی گرانە باوەڕناکەم بتوانی کاری وابکەی. ووتی بەڵێ ئەتوانم و بەلای منەوە کارێکی زۆر ئاسانە.

(ڕێوی) ووتی: توخوا نیشانم بدە چۆن ئەکەی بەگیانی خۆم سوێند ئەخۆم ئەی کۆمەڵی باڵندە خوا ئێوەی بەسەر ئێمەدا گەورەو پایەدار

کردووە ئەوەی ئێوە لە (سەعاتێک)دا ئەیزانن ئێمە بەیەکسالْ نایزانین وەڕێگا بەشتی وائەبەن کەهەرگیز ئێمە ڕێی پێنابەین وەسەرتان ئەخەنە ژێر بالْتان وەلەڕەشەباو سەرما خۆتانی پێئەپارێزن. یاخوا پیرۆزتان بێ و هەر بمێنن، توخوا نیشانم بدە کەچی ئەکەی؟

شینەشاهۆ سەری خستە ژێربالْی. ڕێویەکە پەلاماری دایە. وەلەشوێنی خۆیدا گرتی و ملی شکاند و ووتی: ئەی دوژمنی گیانی خۆت، ڕێگا بۆکۆتر ئەدۆزیتەوەو فێری فێلْی ئەکەی، کەچی بۆخۆت هیچت لە دەست نایە، هەتا دوژمنت بەسەرتا زالْ ئەبێ؟ لەپاشا ڕێوییەکە شینەشاهۆکەی کوشت و خواردی.

کاتێ کەگفتوگۆی پادشاو فەیلەسووفەکە گەیشتە ئەم شوێنە پادشا بێدەنگ بوو. فەیلەسووفەکە پێی ووت: ئەی پادشا هەزار سالْ ژیایت وەسەرۆکایەتی هەرحەوت ناوچەی زەویت کرد وەهەر لەشتێکەوە شتێک فێربووی وەزانینێکت دەست کەوت لەگەلْ شادی خۆت و خۆشبوونی گەل بەرامبەر بەتۆ، وەیارمەتیدانی ڕۆژگار بۆتۆ. زانین و لەسەر خۆیی و قسەی جوان لەتۆدا کۆبۆوە، وەژیری و هیوا لەتۆدا دەر کەوت، ئیتر لەنیازوو قسەکردندا توشی هەلْەو کەم و کورتی و گیرو گرفتی زمان نابی. بووی بەخاوەنی هێزوو دەسەلات و لەسەر خۆیی.

وە لەهیچ شتێک ترست نابێ وەلەگیرو گرفتی کاردا زویر نابی. لەم کتێبەدا ڕێگای هەموو کاروبارێکم بۆ کۆکردیتەوە، وەوەلامی پرسیارە کانتم بۆڕوون کردیتەوە. بەهەموو بیروزانینمەوە ئامۆژگاریم کردی لەبەر بردنە سەری ماف و باوەڕی پاکی تۆ بەکاری مێشك و زانین، ڕەبەو جۆرە هاتەپێش کەباسم بۆکردی لە پەندو ئامۆژگاری، لەگەلْ

ئەوەشدا کەفەرماندەر لەچاکەدا بەئەندازەی گوێڕایەڵ بەختیار نییە، وەئامۆژگاریکەر بەئەندازەی ئامۆژگاری کراو وەمامۆستا بەئەندازەی قوتابی لە ئامۆژگاری و زانیندا کامەران نییە.

ئەوە تێبگە ئەی پادشا کەهیچ هەوڵ و دەستەڵاتێك نییە بەخوای گەورەو سەردار نەبێ.

**تەواو.....**

# پێڕست